كـــــردي

# هيندۆسيەت لە تەرازووی فێرکاریە بنچینەییەکانی وئەقڵ وفیترەتی پاك و سەلامەت

بەپێنووسی:

د. هــيثــم طلـعت



Islamhouse.com

جمعية
خدمة المحتوى الإسلامي
باللغات

جمعية
الدعوة والإرشاد وتوعية
الجاليات بالربوة

بسم الله الرحمن الرحيم

# هیندۆسیەت لە تەرازووی

# فێرکاریە بنچینەییەکانی وئەقڵ

# وفیترەتی پاك و سەلامەت

## (پرسیار و وەڵام)


نووسینی:

د. هيـــثـم طلعت

## بەناوی خوای گەورە ومیهرەبان

# پێشەکی

بسم الله والحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومَن والاه، أما بعد:

هیندۆسـیەت لەوەیە ئاین بێت بەڵام پێناسـاندنی بەزیاتر وردیەوە بریتیە لە : ڕێگایەکە لە ژیان

هیندۆسیەکان نزیکەی ١٥% ی دانیشتوانی جیهان پێکدەهێنن، شوێنکەوتووانی زیاتر لە ملیارێک ودوو سەد ملیۆن کەسە.

هیندۆسیەت بەدرێژایی مێژوو گۆڕانکاری زۆری بەسەردا هاتووە..

هیندۆسیەت لەپاش سەردەمی ڤیداس Vedas پڕبوو لە ناڕوونی وکێشەی زۆری ئەقڵی -درككردن- وزانستی وفیتری کە ئاماژە بۆ هەندێکیان دەکەین لەم کتێبەدا.

بەڵێ!

هیندۆسـیەت زۆر دوورکەوتەوە لە ڕێنمونیەکانی ڤیداسـی بنەڕەتی (سـەرچاوەی بنەڕەتی ئـاینی هینـدۆســـیـەت)، وشـــوێنی ڕێنموێنیەکـانی خەڵکی وڕاهیـب وبهـاگـاڤـاد گیتـا Bhagavad Gita و تانترای باتینی Tantras کەوتن.

لەم کتێبەدا هەوڵدەدەم دادگایی هیندۆسـیەتی ئێسـتا بکەم لەپێش ئەقڵ وزانسـتی سـەردەم ومەنتیق -لۆژیک- وڕێنماییەکانی ڤیداسـی بنەڕەتی کە هێشـتا لەنێو دەسـتی هینـدۆســـیەکانـدایە، وە من دڵنیـام ئەوەی ماوەتەوە لە هەق لە ڤیـدات وئەوەی لە فیترەتی مرۆڤی هیندۆسـیدایە بەسـن بۆئەوەی هیندۆسـی بەسـەلامەتی بگات بە ئاینی هەق وڕاستی.

ڤیدات: پیرۆزترین کتێبی هیندۆسیە بەڕەهایی.

فیترەت: ئەو پاڵنەرەیە کە وا لە مرۆڤ دەکات بیر بکاتەوە لە بوونی وســەرەنجامی، وئـاراســتەکردنی ئەم پاڵنەرە بۆ ئیمـان هێنـان بە الله و بەنـدایەتی کردن بۆی بەپێـی شەریعەتەکەی.

وئاینی هەق: ئەو پەیامەیە کە پاشـــماوەی هەقی تێدایە لە ڤیدا وئەمیش دەنگی فیترەتە و وەحی خودایە بۆ هەموو جیهان، وئەم پەیامە ئاماژە دەکات بۆ نیشـــانەکانی باوەڕهێنان بە یەک خوا پەرســـتی -تەوحیدی الله- لە ڕێنموێنیەکانی ئابانیشـــاد Upanishad उपनिषद् .

لەم کتێبەدا هەوڵدەدەم بەراوردێکی بچووک بکەم لەنێوان هیندۆسیەت لەسەردەمی ڤیدا وهیندۆسیەتی ئەمڕۆ!

چونکە هیندۆسیەت زۆر گۆڕاوە..

زۆر دوور کەوتەوە لە ڕێنموێنیە تەوحیدیە پاکەکان لە ڤیدا، لە هیندۆسـیەتی ئێسـتادا بیروباوەڕ بە یەکگرتنی خوڵقێنەر لەگەڵ بوونەر -وحدة الوجود- هەیە کە باوەڕیان وایە خوڵقێنەر تێکەڵ دەبێت لەگەڵ خوڵقێنراوەکان، واتا خوڵقێنەر وخوڵقێنراو دەبنە یەک شت، وئەم بیروباوەڕە سەیرە تەنها پێچەوانەی ڕێنماییەکانی ڤیدا نیە بەڵکو پێچەوانەی بیرکردنەوەیەی ســـادەی ئاقڵانەیە، چۆن خوا لەگەڵ هەموو شـــتێک تێکەڵ دەبێت، پاشان تۆ ئەی هیندۆسی هەوڵ دەدەیت بە کۆمەڵێک ڕێوڕەسم وهەڵسوکەوت بگەیت بەو خودایە لەکاتێکدا ئەو لەنێو تۆدایە؟

ئایا ئەمە ناڕوونی ودژیەکیەکی ئەقڵی ئاشکرا نیە؟

پاشـان باوەڕهێنان بە یەکگرتنی خوڵقێنەر لەگەڵ خوڵقێنراو -وحدة الوجود- بانگەشـە دەکات بۆ بەڕاسـتدانانی ئاینەکانی تر بەرێژەیی، هەموو ئەو ئاینانەی بت وبەرد پەرسـتی تێدایە ؛ مانای ئەوەیە خوا دەپەرســتن، چونکە بەپێی ئەم بیروباوەڕە خوا بریتیە لە بت وبەرد بۆیە خوا تێکەڵی هەموو شتێک بووە وهەموو شتێکە.

وئەم بەرێژەیی دانانە لەڕاســتیدا دەبێتە هۆی وێرانکردنی مانا وبەهاکان هەروەکو لەم کتێبەدا ڕوونی دەکەمەوە.

ڤیدا بەئاشـــکرایی بانگەشـــە دەکات بۆ ئیمان هێنان بە خودایەک کە جیاوازە لە خوڵقێنراوەکـان، ئەم خوڵقێنراوانە الله دروســـتیـانی کردووە، وخوای گەورە لەنێو خوڵقێنراوەکانی شوێنی نابێتەوە بۆئەوەی تێکەڵیان بێت.

ڤیدا لە ریج ڤیدا ऋग्वेद دەڵێت: (یا اللہ ! خۆر وجیهان هەموویان، ناتوانن تۆ سـنووردار بکەن وشوێنی تۆیان تێدا بێتەوە).[1]

ئەمە بەڵگەیەکی ڕوونە لە ڤیـداوە سـەبـارەت بە هەڵەیی بیربـاوەڕەی تێکەڵبوونی خولْقێنەر لەگەڵ خولْقێنراو -وحدة الوجود-، خوای گەورە جیاوازە لە خولْقێنراوەکانی.

لە هیندۆسیەتی ئێستادا باوەڕیان بە لاشە گۆڕکێی ڕۆحەکان -تناسخ الأرواح- هەیە کە پێیان وایە لەپاش مردن ڕۆحی مرۆڤ دەچێتە نێو بوونەوەری تر بۆئەوەی سـەر لە نوێ لەدایـک بێت لە بوونەوەرێکی نوێدا، هەموو مرۆڤێـک پێشـتر ژیـانێکی هەبوو لەنێو بوونەوەرێکی زیندوو وبەو شـێوەیە، وئەم بیروباوەڕە دەبێتە هۆی کێشـەی زۆر، ئەگەر ئەم بیروباوەڕە ڕاسـت بێت بۆچی ئەو منداڵانەی لەدایک دەبن هەمان توانای ئەقڵی باڵغەکانیان نیە؟ خۆ پێشتر ژیانیان هەبووە و لە نێو لاشەی بوونەوەرێکی تردا بوون؟[2]

پاشـان بیروباوەڕی لاشـەگۆڕکێی ڕۆحەکان لەسـەر کۆمەڵێک لەدایکبوونی دووبارە بنیات نراوە، چۆن ئەمە ڕوودەدات لەکاتێکدا زانست سەلماندوویەتی کە ژیان سەرەتای هەیە، وزەوی لەخودی خۆیدا سەرەتای هەیە وبە ئەزەلی نەبووە.

پاشـان ئەگەر لاشـەگۆڕکێی ڕۆحەکان ڕاسـت بێت ئەوا دەبێت ژمارەی بوونەوەرە زیندووەکان جێگیر بێت، چونکە لاشـەگۆڕکێ دەکەن لەنێو خۆیاندا، وهیچ مرۆڤێک نیە ئەم قسەیە بکات لەم ڕۆژەدا !

لەکاتێکدا ڤیدا دان بە لاشـەگۆڕکێی ڕۆحەکان نانێت، تەنانەت زانای هیندۆسـی شـری سـتیاکام ودیالنکار دەڵێت: (بیروباوەڕی لاشـەگۆڕکێی ڕۆحەکان لە ڤیدات نیە، ومن تەحەدای هەرکەسێک دەکەم وابڵێت).[3]

---

[1] ئەم ماڵپەڕە سەر بە گۆڤارێکی بوزییە کە توێژینەوەی زانستی پێشکەش دەکات سەبارەت بە بوزییەت وڕێوڕەسمەکانی :
http://stholistic.com/prayer/hindu/hol_hindu-samsara-and-karma.html

[2] Cogan, Robert. (١٩٩٨), Critical Thinking: Step by Step, University Press of America, pp. ٢٠٢–٢٠٣.

[3] أواكمن، ل ١٠٤، لەکتێبی: (دعوة الهندوس إلی الإسلام)، ل ٩٩.

باشـترین بەڵگە لەسـەر ڕاسـتێتی قسـەکەی ودیالنکار ئەوەیە هیندۆسـیەکان هەندێک مەراسـیمی ئاینی کۆن جێبەجێ دەکەن بەناوی (شـەڕادە Śrāddha श्राद्ध)، وئامانج لەم مەراسیمانە بۆ : هێورکردنەوەی ڕۆحی مردووەکانە.

چۆن ڕۆحەکان لاشەگۆڕکێ دەکەن لەکاتێکدا ئەوان لە نێو لاشەی مردووەکاندان؟

لە بـــــیروباوەڕی هیندۆسـیەکان لەئێسـتادا : باوەڕیان بە کارما هەیە، بەشـێوەیەک باوەڕیان وایە بەپێی کارما لەدایک دەبن بەپێی سـەرەنجامی کارەکانی پێشـوویان، هەرکەسـێک خراپ بێت ئەوا جارێکی تر لەدایک دەبێت لەژیانێکی نوێ لە چینێکی کەمتر یان بەناڕەحەتی گەورەتر.

بۆیە هیندۆسـیەکان سـەیری کەسـێک دەکەن کە تووشـی ناڕەحەتی بووە بەهۆی ئەو گوناهانەی لەژیانی پێشـووتردا کردوویەتی، وئەم بیرکردنەوە هەڵە ونامۆیە دەبێتە هۆی تێکدانی هەموو ژیان وهیچ خزمەتێک بە مرۆڤایەتی پێشـکەش ناکات، بەڵکو دان بەوەدا دەنێت کە ئەوەی تووشـی خەڵکی بووە لەناخۆشـی وکارەسـات بەهۆی سـزادانی سـروشـتەوەیە لەسـەر تاوانێک کە پێشـووتر کردوویەتی لەژیانی ڕابردووی، ئەمە جۆرێکە لە بەچاکدانانی دواکەوتن وستەم وچینایەتی.

بەڵام گەورەترین کێشە ئەوەیە: ئایا بیروباوەڕی کارما لە چی شوێنێکی ڤیدا هەیە؟

ڤیـدات بەڕوونی بـاسـی ئەوە دەکـات کە بەهەشـــت ودۆزەخ هەیە خوای گەورە دەیبەخشێت بەخەڵکی بەپێی کارەکانیان، نەک لەدایکبوونی نوێ هەبێت لە بوونەوەری تردا.

ریج ڤیـدا دەڵێـت: (بەهەتـاهەتـایی بمکە ئەو شـــوێنەی کە هەموو جۆرەکـانی چێژ وئاسوودەیی تێدایە، کە دەیبەخشیت بە نەفسەکان ئەوەی حەزی لێدەکەن).[٤]

هەروەها لە بیروباوەڕە سەرەکیەکان لە هیندۆسیەتی سەردەم: هەوڵدانە بۆ لەناوبردنی لەدایکبوونە دووبارەکان ولاشـــەگۆڕکێی ڕۆحەکان وگەیشـــتن بە قۆناغێک ناســـراوە بە (موکشـــا Moksha मोक्ष) کە تێیدا مرۆڤ یەکدەگرێت لەگەڵ زاتی خودایی، بەڵام ئەم

[٤] ریج فیدا، مندل: ٩، سوکت: ١١٣، منترا: ٩-١١.

بیرۆکەیە بنیات نراوە لەســەر تێڕوانینێکی تەواو شــوم بۆ بوون، چونکە مەبەســت لە بوون بریتیە لە لەناوبردنی بوون لەلای ئەوان!

ئەم بیرۆکەیە جێی مەترسـیە بۆ سـەر کۆمەڵگا چونکە وا لە مرۆڤ دەکات نەترسـێت، گرنگ نیە چەنێک تاوان دەکات ئەو سـەر لەنوێ لەدایک دەبێتەوە وهەر ڕۆژێک ڕزگاری دەبێت لە یەکێک لە لەدایکبوونەکان.

ئەمە پێچەوانەی ڕێنماییەکانی ڤیدایە کە دەق لەسەر سزادانی ستەمکاران وتاوانباران هەیە لەشـــوێنی تایبەت بۆیان هەروەکو لە ریج ڤیدا دەڵێت: (شـــوێنێکی زۆر قوڵ کە بنەکەی دوورە بۆ تاوانباران).[5]

ئەم شوێنە لەکوێ، وبیرۆکەی دووبارەبوونەوەی لەدایکبوونەکان لەکوێ؟

سەبارەت بە بەناوبانگترین کێشە زانستیەکانی هیندۆسیەکان لەئێستادا: تێڕوانینیەتی بۆ سروشتی دروستبوونی گەردوون، هیندۆسیەتی ئێستا پێی وایە گەردوون دەتوێتەوە -لەناودەچێت- ودووبارە دروست دەبێتەوە وبەم شێوەیە بەردەوامە بێ کۆتایی، وئەمە هەڵەیەکی زانستی سەیرە پێچەوانەی زانستی سەردەمە.

زانراوە کە زانســتی ســەردەم دان بەوەدا دەنێت کە ئەم گەردوونە ســەرەتایەکی هەبوو وپێشی هیچ گەردوونێکی تر نەبووە.

گەردوون لەڕوانگەی زانستیەوە دروستکراوە وخوڵقێنراوە لەسەر نمونە وشێوەیەک کە پێشتر نەبووە.

وئـەمە هەمان ئەو بیروباوەڕەیە کە لە ڤیدا هەیە، لە ڤیدا هاتووە کە ژیانێک دەرکەوت لەناکاو وقیامەت هەیە، بەڵام لە فەلسەفەکان کە لەسەردەمەکانی کۆتا پەیدا بوون لە هیندۆســیەت وەکو بوراناتەکان Puranas ، تێیدا بەئاشــکرا باســی دووبارەبوونەوەی جیهان وئەزەلیەتی کردووە.

هیندۆسـیەتی ئێسـتا پێچەوانەی بیروباوەڕی ڤیدایە، وپێچەوانەی زانسـتی سـەردەمە، وپێچەوانەی ئاینی ئیسلامە کە ئەو هەقەی تێدایە وهەڵیگرتووە کە ڤیدا وتوویەتی.

[5] ریج فیدا، مندل: ٤، سوکت: ٥، منترا: ٥.

بیروباوەڕی مســـوڵمانان کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باســـیکردووە ئەوەیە کە گەردوون دروستکراوە بەبێ ئەوەی هیچ نمونەیەکی هەبێت لەپێشتردا، خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت:

﴿بَدِيعُ السَّـــمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَإِذَا قَضَـــىٰ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾ واتە: ﴿(هەر ئەو زاتە) بەدیهێنەری ئاســـمانەکان و زەویە بەجوانترین شـــێوە، جا هەر کاتێك بڕیاری هەر شتێك بـــدات، تەنها ئەوەندەی بەسە کە فەرمانی بوون یان پێشهاتنی بدات، ئیتر خێرا ئەو شتە، یان ئەو کارە، دەبێت و ئەنجام دەدرێت﴾ [البقرة: ١١٧].

گەردوون بەدیهێنراوە بەپێی ئاینی ئیسلام، واتە پێشتر هیچ نمونەیەکی نەبووە.

ئەمیش سەرەنجامی زانستی سەردەمە، وکەسێک هەواڵی سەبارەت داوە کە شوانێتی مەڕی کردووە پێش زیاتر لە ١٤٠٠ ســـاڵ، بەناوی موحەمەدی کوڕی عبدالله پێغەمبەری خودا وپێغەمبەری ئیسلام -صلى الله عليه وسلم-.

لەم کـــــتێبەدا زۆر کێشـــە وناڕوونی باس دەکەم کە تووشـــی هیندۆســـیەت دەبێت، و لەبەرامبەردا باسی تێڕوانینی ئیسلام دەکەم بۆ جیهان وژیان وپاداشت وسزا ومەبەستی بوون کە بەپێی فیترەت وڕێنماییە ماوەکانی ڤیدایە.

وڕوونی دەکەمەوە چۆن ئـاینی ئیســـلام وردترین ومتمـانەپێکراوترین وتونـدوتۆڵترین نمونەیە بۆ وەڵامدانەوەی پێویســـتیەکانی مرۆڤ بۆ زانینی شـێوازی ژیان -چۆن بژین؟-، وهەروەها بۆ شـــیکردنەوە مانای بوونی مرۆڤ ومەبەســـتی بوونی مرۆڤ بەو پێیەی لەگەڵ ئەقڵ وفیترەت وزانست دەگونجێت.

ئەم کتێبە هەندێک بەڵگەی تێدا باســـکراوە ســـەبارەت بە دروســـتی ئاینی ئیســـلام، وموژدەکان ســـەبارەت بەم ئاینە لە ڤیدا، ڤیدات موژدەی داوە بە ئیســـلام وبە هاتنی پێغەمبەر موحەمەد -صـلى الله عليه وسـلم-، وبانگەوازی هیندۆســیەکانی کردووە بۆ باوەڕهێنان پێی.

ئیســـلام تەنها ئاینێک نیە لەســـەر زەوی وەکو ئاینەکانی تر، بەڵکو تاکە ئاینی تەوحیدیە کە خوای گەورە هەموو پێغەمبەرانی پێ نـاردووە، هەموو پێغەمبەران تەوحیـدیـان هێناوە بۆ خەڵکی وتەنها ئاینی ئیسـلام لەسـەر ئەو تەوحیدە پاکە ماوە کە پێغەمبەران هێنایان، لەکاتێکدا شـــیرک وهاوبەشـــدانانی بۆ الله ؛ تێکەڵ بە ئاینەکانی تر وبووە بە بەشێك لە بیروباوەڕیان جا زۆر یان کەم بێت.

خوای گەورە هیچ ئـاینێـک قبولْ نـاکـات لە مرۆڤ جگە لە ئیســـلام، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْـــلَامِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِـــرِينَ﴾ واتە: ﴿جائەوەی بێجگە لە ئاینی ئیســـلام پەیڕەوی هەر ئاینێکی تر بکات لێی وەرناگیرێت، لەقیامەتیشدا لە خەسارەتمەندو زەرەرمەندانە﴾ [آل عمران: ٨٥].

ئیسلام ئەو ئاینەیە کە خوای گەورە هەموو پێغەمبەرانی پێ ناردووە.

ســـەرەکیترین تایبەتمەندی ئیســـلام بریتیە لە : بەمانای تەســـلیم بوون وملکەچی بۆ خوای گەورە و بەتەنها پەرستنی ئەو زاتە دێت، ونکۆڵی کردن لە بەرجەستەکردنی خوای گەورە لە بت وشتی تر وەکو هیندۆسیەت لەئێستادا.

پاشـــان کتێبەکە کۆتایی دێت بە ڕوونکردنەوەی ئەوەی چۆن مرۆڤ مســـوڵمان بێت بۆ خوای گەورە، وڕوونکردنەوەی گرنگی ومانای ئیسلام.

با گەشتی کتێبەکە دەست پێبکەین بە بەرەکەتی خوای گەورە ..

# بەشی پرسیار و وەڵام

## ١- هیندۆسیەت چیە؟

هیندۆســیەت: ئاینێکە یان بەمانایەکی وردتر: (بریتیە لە شــێوازێك -ڕێگایەك- بۆ ژیان -لەم دونیایەدا-)، ئەمیش کۆمەڵێک دروشــم وڕێوڕەســم وپەرســتن وکتێبی پیرۆز وتێگەیشتنی گەردوونی وبوون دەگرێتەوە.[٦]

هینـدۆســـیەت پێکهـات لە ســـەردەمـانێکی کۆنەوە لەڕێگـای کۆبوونەوەی کۆمەڵێک بیروباوەڕی مەزهەبی بۆ دانانی ڕێکخسـتەیەکی باوەڕی هەمەجۆر وهەندێ جار دژیەک، وهیندۆسـیەت لەئێسـتادا هیچ ڕەخنەیەکی لەمە نیە، چونکە لەئێسـتادا هیندۆسـیەت خاوەنی یەک عەقیدە وسەرچاوە ودەق نیە کە خەڵکی پابەندی بن وحوکمی پێبکەن.

ئەگەرچیش ڤیدات پیرۆزترین کتێبەکانی هیندۆسـیەتە بەڵام هیندۆسـیەکان هەروەکو لەم کتێبەدا پیشـــانی دەدەین پێچەوانەی دەبنەوە بەشـــێوەی جۆراوجۆر وســـەیر، هیندۆسـیەت بە سـەرپێچیکردنی ڤیدا تێڕوانینی هەمەجۆر قبوڵ دەکات وبیرکردنەوەی دووریەک کە هیچ پەیوەندیەکی بە سەردەمی ڤیداتی یەکەمەوە نیە.

بەشــێوەیەکی گشــتی هیندۆســیەت هەوڵدەدات بۆ خۆڕزگارکردن لە ئازارەکان، ودواتر شیدەکەینەوە چۆنیەتی خۆڕزگارکردن لە ئازار لەتێڕوانینی ئەوان چۆنە، وچۆن سەرپێچی بیروباوەڕی ڤیدایان کرد سەبارەت بە خۆ ڕزگارکردن کە هێشتا هەقی تێدا ماوە.[٧]

---

[٦] دراسة الهندوسية، أرفيند شارما (غير مترجم).

[٧] الهندوسية: العقيدة والممارسة، جينين د. فاولر (وەرنەگێڕدراوە).

## ٢- چۆن ئەم ئاینە سەری هەڵدا بە ئەم تێکەڵاوییە؟

هیندۆسیەت واتا هیند، هیند بریتییە لە دەوڵەت وکەشوهەوا ومێژوو وتێکەڵی وکلتوورەکان.

ئاینێکە نزیکە لەوەی تایبەت بێت بە هند، کە ٩٥% ی هیندۆسیەکانی جیهان لەوێ دەژین.[٨]

هیندۆسیەت لەسەر بنەماکانی ڤیداتی یەکەم دامەزرا بەڵام تێکەڵ بوو بە فەلسەفە وبیروباوەڕ وکتێب وبۆچوونی تر بەدرێژایی سەردەمەکان، هیندۆسیەت لەپاش سەردەمی ڤیدات شوێنی ڕێنمایی ڕاهیل وتانترای باتینی Tantras و بهاغاڤاد ڤیتا भगवद्गीता کەوت.

لە پێش زیاتر لە ١٥٠٠ پێش زایین هەتاوەکو ساڵی ٥٠٠ ی زاینی زۆرێک لەم بۆچوون وفەلسەفانە تێکەڵ بە ڤیدات بوون وزاڵ بوون بەسەریدا، لەئەمڕۆدا هیندۆسیەت لەڕووکەشدا تەنها ئەم بۆچوون وفەلسەفانەیە.

## ٣- ئایا بەوردی بیروباوەڕی هیندۆسەکان چییە؟

هیندۆسیەت لەئێستا ئەو بیروباوەڕەیە کە باوەڕی بە زۆر خوا هەیە، لە هیندۆسیەتدا ژمارەیەکی نادیاریکراو خوا هەیە، وهیندۆسەکان لەگەڵ ئەمەشدا باوەڕیان تەنها بە یەک خوا هەیە ئەویش الله یە.

ئەوان باوەڕیان وایە خوا تێکەڵی هەموو ئەم شتانە دەبێت کە بەپیرۆزیان دادەنێن.

لەوەیە هەندێک بۆچوونیان وابێت: بیروباوەڕی هیندۆسیەکان بە یەک خوا و باوەڕیان بەوەی ئەو بت وشتانەی لایان پیرۆزە شێوەی خودان ؛ ئەمە بت پەرستی نیە!

ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە!

---

[٨] http://www.pewforum.org/files/٢٠١٢/١٢/globalReligion-tables.pdf

باوەڕ بەوەی ئەو بت وپەیکەرانە نمونەن بۆ شـــێوەی خودا ؛ ئەمە بنچینەی بیروباوەڕی بـت پەرســـتیە کە پێچەوانەی ڕێنموێنیەکـانی پێغەمبەران وفێرکردنەکـانی ڤیـداتە لە هەموو مێژووی مرۆڤدا.

هەموو موشـــریکەکان کە پێچەوانەی پێغەمبەران وپێچەوانەی فێرکردنەکانی ڤیدات بوون ؛ باوەڕیان بە الله هەبووە، بەڵام ئەوان بت وپەیکەریان دروست دەکرد ودەیانووت ئەمانە نوێنەری خودان، باوەڕی موشـــریکەکان بە بوونی الله کە ئەو تاکە، ئەمە مانای ئەوە نیە کوفریـان پێنەکردووە وکوفریـان بە پەیـامبەران وڤیـدات نەکردووە بەهۆی بیروباوەڕیان بەو بتانە وپەرستنیان.

ڤیدات ڕوونە ویەکلاییە سەبارەت بە حەرامبوونی بت وپەیکەر پەرستی، یان نزیکبوونەوە لێیان یان بەپیرۆز دانانیان،

ڤیدا دەڵێت: (ئەوەی جگە لە الله دەپەرستێت لە شتە دروستکراوەکان، ئەوا ڕۆ دەچێت لە تاریکی وسزای ئاگر دەچێژێت ماوەیەکی نادیاریکراو).[9]

هەرکەســـێک ئەم بتانە بپەرســـتێت ئەوا بەپێی ڤیدا ئەو کەســـە بەهەتاهەتایی لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە ؛ لەکاتێکدا ئەمڕۆ لە ئاینی هیندۆسـیەت هەموو شـوێنێکیان ئەم بتانەی تێدایە.

ڤیدا دەڵێت: (خاوەنداری هەموو زانای غەیب، کە پێویســتی بە یارمەتی پەرسـتراوەکانی تر نیە، ئەو الله یە کە شـایســتەی ئەوەیە مرۆڤ بیپەرســتێت، ئەوانەی پەســتراوی تر دەپەرستن ئەوانە تیاچووەکانن، بەردەوام کارەساتی گەورە وترسێنەر دێتە پێشیان).[10]

بەڵکو لە بهـاغـاڤـاد گیتـا भगवद्गीता Bhagavad Gītā هـاتووە : (ئەوانەی خوایەکـان دەپەرستن دەگەن بە خواکان، وئەوانەی پێشین دەپەرستن دەگەن بە پێشین، ئەوانەی شەیتان دەپەرستن دەگەن بە شەیتان، ئەوانەی من دەپەرستن دەگەن پێم).[11]

---

[9] یجر فیدا، سوکت:٤٠، منترا:٩.

[10] ریج فیدا، مندل١، سوکت:٧، منترا:٩.

[11] بهاغافاد غیتا، ٩-٢٥.

ئەم دەقانە وهاوشـێوەکانیان زۆرن کە بانگەوازی هیندۆسـیەکان دەکەن بۆ بەتاکدانانی الله و وازهێنان لە بت پەرسـتی، هەتاوەکو مهارشـی دیانند سـرسـوتی دەڵێت: (هیچ پیتێک نیە لە ڤیدات کە ئاماژە بکات بۆ پەرسـتنی بتە دروسـتکراوەکان لە بەرد وشـتی تر).

هیندۆسـیەکان لەسـەردەمەکانی پاشـتر وازیان لە بیروباوەڕی تەوحید هێنا لە ڤیدات وشوێنی ڕێنموێنی پوچەڵ کەوتن.

قورئانی پیرۆز کە خوای گەورە دایبەزاند بۆ سـەر پێغەمبەرەکەی موحەمەد -صـلی الله علیه وسلم- جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە بت پەرستەکان هەرچەندە بانگەشەی ئەوە دەکەن باوەڕیان بە الله ی تاک هەیە بەڵام لەگەڵ ئەمەشـدا ئەوان بەم بت پەرستیەیان کوفریان بە الله کردووە.

خـوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّـهُ﴾ واتە: ﴿ئەگەر لە بێ باوەران بپرسیت: کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە؛ بێ دوودڵی و بەئەوپەڕی دڵنیاییەوە دەڵێن: الله﴾[الزمر: ٣٨].

وپەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّـهُ﴾ واتە: ﴿سـوێند بەخوا ئەگەر لەو خوا نەناسـانە بپرسـیت: کێ دروسـتی کردوون، ئەوە بەدڵنیاییەوە دەڵێن (الله)﴾[الزخرف: ٨٧].

پەرسـتنی ئەم بتانە ونزیک بوونەوە لێیان بە جۆرەکانی پەرسـتن ؛ وا دەکات مرۆڤ کافر بێت بە الله بەپێی قورئان وڤیدا.

خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّـهِ أَوْثَانًا وَتَخْلُقُونَ إِفْكًا إِنَّ الَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّـهِ لَا يَمْلِكُونَ لَكُمْ رِزْقًا فَابْتَغُوا عِندَ اللَّـهِ الرِّزْقَ وَاعْبُدُوهُ وَاشْكُرُوا لَهُ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ واتە: ﴿بەڕاسـتی ئەو شـتانەی کە لەجیاتی خوا دەیـانپەسـتن تەنها بت و پەیکەرن، ئێوە بوختان و شـتی نابەجێ دروسـت دەکەن، بێگومان ئەو شـتانەی کە لەجیاتی خوا دەیانپەرسـتن خاوەنی هیچ ڕزق و ڕۆزیەك نین بۆ ئێوە، کەواتە هەر داوای ڕزق و ڕۆزی لە خوا بکەن، هەر ئەویش بپەرسـتن، هەر سوپاسگوزاری ئەو بن، بۆ لای ئەویش دەبرێنەوە﴾[العنکبوت: ١٧].

داوای ڕزق لە خوای گەورە بکەن وتەنها ئەو بپەرســـتن، چونکە هەمووومان تەنها بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە.

ئەو تاکە ئاینە لەســـەر زەوی کە لەســـەر تەوحید ماوەتەوە وهەموو شـــێوە و وێنەکانی شیرک وهاوبەشدانانی بۆ خوای گەورەی تێدا نیە بریتیە لە ئاینی ئیسلام.

بۆیە واجبە لەسەر هیندۆسی بەچاوڕۆشنیەوە سەیری ئیسلام بکات بەبێ دەمارگیری، وسەیری بیروباوەڕی تەوحید بکات لەم ئـــاینەدا ، ئایا بەپێی فیترەتی پاکە وئایا بەپێی ئەوەیە کە ڤیدا لەسەری بووە، یان نا ؟

بـانگەوازی هەموو پێغەمبەران کە خوای گەورە ڕەوانەی کردوون بۆ مرۆڤ بریتی بووە لە: بەتاکدانانی خوای گەورە لە پەرســـتنیدا، ئەمیش دەبێت بە کوفر ونکۆڵی کردن بێت لە بت پەرستی وپەرستنی شتی تر وهەروەها ملکەچبوون بۆئەوەی پێغەمبەرانی خودا پێی هاتوون، وئەوەی کۆتا پێغەمبەر پێی هاتووە موحەمەدی کوڕی عبدالله -صلی الله علیه وسلم-.

## ٤- چـۆن بەرجەســـتەکـردنـی یەک خـودا لە دەیەهـا بـت لە هیندۆسیەتدا سەریهەڵدا؟

کێشـــەی گەورەی هیندۆســیەت لە ئێســتادا لەپاش ســـەردەمی ڤیدات : ئەگەری ئەوە دائەنێن چونکە خوا ســیفەتی جیاواز وزۆری هەیە، بـــــۆیە وا دەخوازێت کە زاتی زۆری هەبێت، واتا: دەبێت ژمارەیەک زۆر خودا هەبن.

ئەوان ئەگەری ئەوە دائەنێن هەموو ســـیفەتێکی خودایی بتێکی هەیە کە نوێنەری ئەو سیفەتەیە.

خوڵقێنەر لای ئەوان بەم شێوەیە:

براهما: دروستکاری گەردوون.

فشنو: پارێزەری گەردوون.

شیفا: وێرانکەری گەردوون.[١٢]

ئەمە ئەگەرێکە پێچەوانەی بیرکردنەوەی سەرەتایی ئەقڵ وفیترەتە وپێچەوانەی ئەوەیە کە لە ڤیدا هاتووە، چونکە زۆری سیفەتەکان مانای زۆری زاتەکانی نیە.

لەوەیە مرۆڤ زیرەک وبەهێز وبەڕەوشت بێت.

بۆیە زۆری سیفەتەکان لەیەک مرۆڤدا مانای ئەوە نیە زیاتر لە یەک زاتی هەیە.

مرۆڤی زیرەک هەر خۆی بەهێز ورۆشنبیر و بەڕەوشتە.

بەرزترین نمونە بۆ خوای گەورەیە -سبحانە وتعالی- !

وڤیدا جەخت لەسەر ئەم هەقیقەتە دەکاتەوە، لە ڕیج ڤیدا هاتووە: (ناوی لێدەنین بە : ئیندرا، میترا و وایو ئەویش ماترشوایە، داناکان ناوی یەک خودا دەهێنن بەڵام بەناوی جیاواز).[١٣]

ودەقەکان سەبارەت بە ناو وسیفەتەکانی خوای گەورە زۆرە لە ڤیدات.

ناو وسیفەتەکان تایبەتە بە یەک زات.

ئەمە بیروباوەڕی ڤیداتی یەکەم بووە وهەروەها ئەمە بیروباوەڕی ئیسلامیە، خوای گەورە -سبحانە وتعالی- تاکە لە ئیسلامدا لە ناو وسیفەتە بەرزەکانی، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَإِلَـٰهُكُمْ إِلَـٰهٌ وَاحِدٌ لَّا إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَـٰنُ الرَّحِيمُ﴾ واتە: ﴿خوای ئێوە خوایەکی تاك و تەنهایە، جگە لەو زاتە خوایەکی تر نیە، هەر ئەو خوایەش بەخشندەو میهرەبان و بەبەزەییە﴾[البقرة: ١٦٣].

خوای گەورە الرحمن والرحيم ە -بەبەزەیی وبەخشندە-.

پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿هُوَ اللَّـهُ الَّذِي لَا إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلَامُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ سُبْحَانَ اللَّـهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ واتە: ﴿خوا ئەو زاتەیە کە جگە لەو هیچ شتێک

[١٢] موسوعة الفلسفة الشرقية والدين، ستيفان شوماخر، ل٣٩٧.

[١٣] ريج فيدا: مندل: ١، سوكت: ١٦٤، منترا: ٤٦.

شایستەی پەرستن نیە بەهەق پاشای هەموو بوونەوەرە، پاك و بێگەردە، ئاشتی خواز و ئاشتی پەروەرە، ئاسایش بەخش و پەناگای ئیماندارانە، دەسەڵاتدارە و چاودێری دروستکراوەکانیەتی، باڵادەستە، خاوەن شکۆ ومەزنێتیە وهەموو هێزێک ئەشکێنێ، گەورەیە و خۆی بەگەورە دەزانێت، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەیە لەوەی تێنەگەیشتوان شەریك و هاوەڵی بۆ بڕیار دەدەن﴾[الحشر: ٢٣].

ئەم ناو وسیفەتە جیاوازانە تەنها تایبەتن بە اللە ی تاك وبێ هاوتا.

وکێشەی دووەم بریتیە لە بەرجەستەکردنی سیفەتەکانی خوا لە شێوەی بتی جیاواز لەکاتێکدا گەردوون شوێنێکی ئاسایش نیە لەگەڵ ئەم بت پەرستیەدا.

بۆیە قورئانی پیرۆز نکۆڵی دەکات لەم بیرۆکە وتێڕوانینە بت پەرستیانە سەبارەت بە خوای گەورە، وجەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی پەرستنی پەرستراوی تر لەگەڵ خوای گەورە دەبێتە هۆی نەبوونی ئاسایش لەهەموو گەردووندا،

﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّـهُ لَفَسَدَتَا فَسُبْحَانَ اللَّـهِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ واتە: ﴿ئەگەر لە هەردووکیاندا (لە ئاسمان و زەویدا) چەند خوایەکی تر هەبوایە غەیری (اللە)، ئەوە کاول و وێران دەبوون و تێک دەچوون بەسەر یەکدا، پاکی و بێگەردی بۆ خودا کە پەروەردگاری عەرشە، لەو باس و خواسانەدا (کە خوانەناسان) دەیڵێن (هاوەڵ بۆ ئەو زاتە بڕیار دەدەن)﴾[الأنبياء: ٢٢].

ئەگەر خوای تر هەبووایە لەگەڵ اللە ئەوا ئاسمانەکان وزەوی تێکدەچوون وخراپ دەبوون.

﴿وَلَوِ اتَّبَعَ الْحَقُّ أَهْوَاءَهُمْ لَفَسَدَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ بَلْ أَتَيْنَاهُم بِذِكْرِهِمْ فَهُمْ عَن ذِكْرِهِم مُّعْرِضُونَ﴾ واتە: ﴿ئەگەر حەق و ڕاستی شوێنی ئارەزووی ئەوان بکەوێت، ئەوە ئاسمانەکان و زەوی و هەموو ئەوانەی تیایاندایە دەشێواو تیا دەچوو سەر گەردان دەبوو، نەخێر (حەق وایە ڕقیان لێی نەبێت)، چونکە ئێمە قورئانێکمان بۆ هێناون (کە یادی هەموو چاکەیەکیان بخاتەوە، کەچی ئەوان لەبەرامبەر ئەو یادخەرەوانەدا سەرکەش و یاخین و پشتی تێدەکەن﴾[المؤمنون: ٧١].

## ٥- هیندۆســیەکان چۆن دەڕواننە پەیوەندی لەنێوان خوڵقێنەر وخوڵقێنراو؟

زۆربەی هیندۆســیەکان ئەمڕۆ باوەڕیان بە بیروباوەڕی یەکگرتنی خوا لەگەڵ خوڵقێنراوەکان -وحدة الوجود- هەیە، خوا لە بیروباوەڕی هیندۆسیەتی ئێستا تێکەڵ بە خوڵقێنراوەکانی دەبێت، بەشێوەیەک بوونەوەرەکان وخوڵقێنەر دەبنە یەک شت.[١٤]

ئەمە پێچەوانەی سەرەتاییترین زانست وئەقڵ وتێروانین وڤیدایە.

کێشــەی زانســتی وئەقڵی زۆر هەیە لە فەلســەفەی یەکگرتنی خوا لەگەڵ خوڵقێنراو -وحدة الوجود-، لەوانەش:

کێشــەی یەکەم: خوا لای ئەوان تێکەڵی هەموو شــتێک دەبێت، ئیتر مانای ئەو مەراســیمانە چیە بۆ گەیشــتن بە یەکگرتن لەگەڵ خوا کە پێی دەڵێن: (موکشــا Moksha मोक्ष) ؟

چۆن دەگەیت بەشتێک کە ئەو لەناختدایە .. تۆ تێکەڵی بوویت وئەو تێکەڵی تۆ بووە ؟

کێشەی دووەم: هەڵە وتاوانەکان خودی خوایە بەپێی بیروباوەڕی یەکگرتنی خوا لەگەڵ خوڵقێنەر -وحدة الوجود- لای ئەوان، چونکە خوا لای ئەوان بریتیە لە هەڵە وتاوان وزینا وکوشتن چونکە ئەو تێکەڵی هەموو شتێک بووە، وئەو زاتی هەموو شتێکە؛ ئیتر بۆچی خۆیان دەرباز دەکەن لە هەڵە وتاوانەکان؟

بۆچی پێداگیرن لەسەر دوورکەوتنەوە لە شەهوەت وهەوا وئارەزووی دونیایی؟

ئایا تاوانکردن بەشــێک نیە لەبیروباوەڕی یەکگرتنی خوا لەگەڵ خوڵقێنەر -وحدة الوجود-؟

ئایا خودی دونیا خودی زاتی خوا نیە؟

نابێت هیچ پاساوێک هەبێت بۆ سووربوون لەسەر کردنی خێر بەپێی ئەم تێگەیشتنە هیندۆسیە لەئێستادا.

بەڵام هەمووان بەپەرۆشن لەسەر کردنی خێر ودەزانن ئەمە واجبە، ئایا وانیە؟

---

[١٤] موسوعة الهندوسية، جونز ورايان وجميس د.، ل ٣١٥ (وەرنەگێڕدراوە).

بەپەرۆش بوون لەسەر کردنی خێر وەڵامدانەوەی بانگی فیترەتی پاکە، ئەمە بەڵگەیەکی فیتری ڕاستەوخۆیە لەسەر چەوتی فەلسەفەی یەکگرتنی خوا لەگەڵ خوڵقێنەر -وحدة الوجود-.

کێشەی سێیەم: کاتێک باوەڕیان بە یەکگرتنی خوا لەگەڵ خوڵقێنەر -وحدة الوجود- هەبوو ئەمە بووە هۆی باوەڕبوون بە ڕێژەیی هەقیقی -النسبية الحقيقة-، هەموو ئەو ئاینانەی کە بت وبەرد دەپەرستن لای ئەوان پەرستنی خودایە، چونکە لەتێگەیشتنی ئەوان خوا بریتیە لە بت وبەرد چونکە خوا تێکەڵ بەهەموو شتێک بووە وئەو هەموو شتێکە.

ڕێژەیی هەقیقی بانگەشە دەکات بۆ لەدەستدانی مانا وبەهاکان، هەموو شتێک ڕاست دەبێت!

سەرەڕای ئەوەی پێشوو: باوەڕبوون بە یەکگرتنی خوا لەگەڵ خوڵقێنەر -وحدة الوجود- وەڵامی ئەم پرسیارە ناداتەوە: جیهان لەکوێوە هاتووە؟

بانگەشەی ئەوەی زاتی خوڵقێنەر بریتیە لە زاتی خوڵقێنراو ئەمە ئەگەر وبانگەشەیەکی نالۆژیکی ونائەقڵانەیە، چونکە ئەگەری دەرکەوتنی شتێک دەبەستێتەوە بە دەرکەوتنی خودی شتەکە.

ئەمیش دژیەکیەکی نامۆیە، ومەحاڵێکی ئەقڵیە.

چۆن شتێک دەبێتە هۆی دەرکەوتنی خودی شتەکە، لەکاتێکدا هێشتا خۆی لەبنەڕەتدا دەرنەکەوتبێت.

کێشەی چوارەم: لەڕوانگەی زانستیەوە سەلێمنراوە گەردوون و هەموو ئەوەی تێدایە هاتوونەتە بوون، وئەمە جێگیرە لەلای هەموو خاوەن ئەقڵەکان.

گەردوون وهەموو ئەوەی تێیدایە لە وزە وماددە وشوێن وکات هاتوونەتە بوون...

وسەلێمنراوە کە گەردوون سەرەتای هەیە بە بەڵگەی زۆری بێسنوور، لەڕوانگەی زانستیەوە: پێشتر گەردوون نەبوو پاشان دەرکەوت.

ئەگەر پێشتر گەردوون بوونی نەبێت، ئیتر چۆن بڕیاری باوەڕبوون بە یەکگرتنی خوا لەگەڵ خوڵقێنەر -وحدة الوجود- بدەین؟

باوەڕبوون بە یەککگرتنی خوا لەگەڵ خوڵقێنەر -وحدة الوجود- ئەگەر ڕاســت بووایە ئەوا دەبوو جیهان ئەزەلی بووایە یان بەلایەنی کەمەوە مادده ئەزەلی بووایە.

ئەوەی سەیرە هیندۆسیەکانی ئەم سەردەمە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە جیهان ئەزەلیە چونکە ئەمە قســەیەکی گرنگە بۆ پاســاو هێنانەوە بۆ بیروباوەڕی یەککگرتنی خوا لەگەڵ خوڵقێنەر -وحدة الوجود-.

زانای هیندۆســـی وویکانند Wiwekanand دەڵێت: (شـــوێن کات -زەمەن- ڕووداوی بەسەردا جێبەجێ نابێت).[١٥]

هیندۆســـیەکانی ئەم ســـەردەمە ناچارن بڵێن کە جیهانی ماددی ئەزەلیە چونکە ئەمە دەگونجێت لەگەڵ باوەڕبوون بەیەککگرتنی خوا لەگەڵ خوڵقێنەر -وحدة الوجود-.

نەدەبوو خۆیان بخەنە نێو ئەم پوچەڵێتیە، ونەدەبوو لەســەرەتادا باوەڕیان بە یەککگرتنی خوا لەگەڵ خوڵقێنەر -وحدة الوجود- هەبوایە، بەڵام شــەیتانەکان لەســـەر ڕێچکەکان دانیشـــتوون بۆئەوەی مرۆڤ گومڕا بکەن ولای بدەن لە ئاینی پێغەمبەران هەرکاتێک هەلیان بۆ بڕەخسێت.

خوای گەورە لەفەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرموێت:

(من بەندەکانم لەســەر فیترەتی بیروباوەڕی ڕاســت خوڵقاند، وئەوان شــەیتان هاتن بۆ لایان ولە ئاینەکەیان لایان دان، وئەو شتانەی لەسەریان حەرامکرد کە من بۆیانم حەڵاڵ کردبوو، وفەرمانی پێکردن کە هاوبەشـــم بۆ بڕیار بدەن لەکاتێکدا من هیچ بەڵگەیەکم لەسەری -لەسەر ئەم هاوبەش بڕیاڕدانە- دانەبەزاندووە).[١٦]

هەموو مرۆڤەکان لەسەر بیروباوەڕی تەوحید -یەک خوا پەرستی- بوون، وشەیتانەکان هاتن وهەڵیانخەڵەتاندن بەم کوفر وبێباوەڕیانە.

---

[١٥] (p. ٦١-٦٣) Hinduism, Hinduism, Wiwekanand. وەرگیراوە لە کتێبی: دعوة الهندوس إلى الإسلام، دانەر : د. إبراهيم بن عبد الغفور ، پەیامی دکتۆرا، دار إيلاف للنشر والتوزيع، ل ١٢٢.

[١٦] صحيح مسلم : ٢٨٦٥.

وپێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: (شەیتان دانیشتووە بۆ نەوەی ئادەم لەسەر ڕێچکەکانی).[17]

شـــەیتان بەدوای هەر ڕێگایەک دەگەڕێت بۆ گومڕاکردنی مرۆڤ، ورزگاربوون نیە مەگەر بەدەســـتگرتن بەو ڕێبازەی پێغەمبەران لەســـەری بوون لە تەوحید وپەرســـتنی خوای گەورە.

ڤیدا بەئاشکرا دەڵێت کە جیهان دروستکراوە وسەرەتای هەیە.

وخوای گەورە جیاوازە لە خوڵقێنراوەکانی وتێکەڵیان نابێت.

ئیتر چۆن هیندۆسیەکان گەیشتن بەم قۆنـــاغە لەبیروباوەڕ بە یەکگرتنی خوا لەگەڵ خوڵقێنەر -وحدة الوجود-، ڕیج ڤیدا دەڵێت: (ئەی اللّه ! خۆر وجیهان هەموویان، ناتوانن دەورت بدەن وشوێنی تۆیان تێدا بێتەوە).[18]

ئەمە بەڵگەیەکی ڕوونە لە ڤیداوە لەســەر هەڵەی باوەڕبوون بە بەیەکگرتنی خوا لەگەڵ خوڵقێنەر -وحدة الوجود-، خوای گەورە جیاوازە لە بوونەوەرەکانی، وخۆر ومانگ خودا نین.

وهەروەها ڕیج ڤیدا دەڵێت: (خوای گەورە کە شــەو ورۆژی دروســتکردووە، ئەو خاوەنی دونیا وئەوەی تێیدایە، وئەو خۆر ومانگ وزەوی وئاسمانی دروستکردووە).[19]

چی بیروبـــــــاوەرێک ڕوونتر هەیە لەمە لە نکۆڵی کردن لە بیروباوەڕی یەکگرتنی خوا لەگەڵ خوڵقێنەر -وحدة الوجود- وئەزەلیەتی جیهانی ماددی؟

یەجور ڤیـدا دەڵێـت: (ئەو زاتەیە کە هیچ شـــتێـک لەپێش ئەو نەخوڵقێنراوە، وئەو خوڵقێنەری ئێمەیە وپاشای -خاوەنداری- ئێمە وهەموو شتێک دەزانێت).[20]

[17] صحيح سنن النسائي : ٣١٣٤

[18] ريج فيدا، مندل:١، سوكت:١٠، منترا:٨.

[19] ريج فيدا، مندل: ١٠، سوكت:١٩٠، منترا: ٢-٣.

[20] يجر فيدا، سوكت: ٣٢، منترا:١٣.

هیچ شتێک لەپێش خوای گەورە دروست نەکراوە، ئەو یەکەم وسەرەتایە وجیهان خوا دروستی کردووە وئەزەلی نیە : (ئەو مەزنە خاوەنی زەوی وئاسمانەکان).[21]

وقورئانی پیرۆز جەخت دەکات لەسەر ئەم هەقیقەتە مەزنە، خوای گەورە وەحی نارد بۆ پێغەمبەرەکەی موحەمەد کوڕی عبدالله -صلى الله عليه وسلم- لەپێش زیاتر لە ١٤٠٠ ساڵ سەبارەت بەوەی خوای گەورە جیاوازە لە خوڵقێنراوەکانی و زاتی مەزنی لەسەرووی عەرشە وتێکەڵ نابێت ویەکناگرێت لەگەڵ خوڵقێنراوەکانی.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿اللَّـهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ مَا لَكُم مِّن دُونِهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا شَفِيعٍ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ﴾ واتە: ﴿خوا ئەو زاتەیە کە ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لە نێوانیاندا هەیە لە شەش ڕۆژدا دروستی کردووە (مەرج نیە درێژی ئەو ڕۆژانە بەقەدەر درێژی شەو و ڕۆژی زەوی بێت کە بە بیست و چوار سەعات جارێک بەدەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە، چونکە هەندێک ڕۆژ هەروەک قورئان خۆی ئاماژەی بۆ دەکات هەزار ساڵە، هەندێکی تری پەنجا هەزار ساڵە)، پاشان خوا لەسەر عەرشە سەرپەرشتی کارو فرمانی دروستکراوانی دەکات و ئەوەی ئەو عیلمی پێی هەیە و دەیزانێت و دەیوێت، هەر ئەوە پێش دێت، خەڵکینە جگە لەو خوایەکەس نیە پشتیوانیتان لێ بکات یان تکا کارتان بێت، ئایە یاداوەری وەردەگرن و تێدەگەن﴾[السجدة: ٤].

بنچینەی بیروباوەڕی پێغەمبەران وبنچینەی ئاین وشەریعەتەکەیان ئەوەیە کە الله خوڵقێنەرە وتاکە وجیاوازە لە خوڵقێنراوەکانی ؛ واتا یەکناگرێت لەگەڵیان وتێکەڵیان نابێت !

کێشەی پێنجەم: لە بیروباوەڕی یەککگرتنی خوا لەگەڵ خوڵقێنەر -وحدة الوجود- ئەوەیە ئەم فەلسەفەیە وەڵامی گرنگترین پرسیار ناداتەوە: ئایا جیهان لەکوێوە هاتووە؟

ئایا جیهان چۆن دەرکەوت بەپێی ئەم فەلسەفەیە؟

پاشان: کێ سەرەتای ئەم فەلسەفەیەی دامەزراند؟

---

[21] ریج فیدا، مندل:١، سوكت: ١٠٠، منترا:١.

ئایا بەڵگەکان لەسەری چین؟

پرسـیار وناڕوونی زۆر هەیە سـەبارەت بەم بیروباوەڕە کە پێچەوانەی زانسـتی سـەردەم وئەقڵ وڤیدا وئاینی پێغەمبەرانە.

## ٦- ئایا هیندۆسیەت چۆن دەڕوانێتە ژیان ومردن؟

هیندۆسـیەتی ئێسـتا دامەزراوە لەسـەر بیروباوەڕی لاشـەگۆڕکێی ڕۆحەکان وبازنەی لەدایکبوونەکان کە کۆتا نایەت: ئێمە بەپێی تێڕوانینی هیندۆسـی دەخولێینەوە لە بازنەیەک لەدایکبوونی دووبارە و یەک لەدوای یەک، هەموو منداڵێک پێشـتر بوونی هەبووە لە بوونەوەرێکی پێش خۆی، وپاش مردنی ڕۆحەکەی دەچێتە نێو بوونەوەرێکی ترەوە وبەو شـێوەیە، ئەمە لە هیندۆسـیەتدا ناسـراوە بە دەسـتەواژەی: سـامسـارا Saṃsāra संसार ، ناڕوونی ئەقڵی وزانسـتی زۆر هەیە لە بابەتی لاشـەگۆڕکێی ڕۆحەکان -تناسخ الأرواح- ولەوانەش:

کێشـەی یەکەم: ناسـراوە بە (ناڕەزایی دەربڕینی تەرتولیان (Tertullian's objection ودەڵێـت: ئەگەر لاشـەگۆڕکێی ڕۆحەکـان ڕاسـت بووایە ئەی بۆچی منـداڵە تـازە لەدایکبووەکان هەمان توانای ئەقڵی باڵغەکانیان نیە؟[٢٢]

کێشەی دووەم: ئەگەر لاشەگۆڕکێی ڕۆحەکان ڕاست بووایە، دەبوو ژمارەی بوونەوەرەکان جێگیر بێـت، چونکە لەنێوان خۆیـان لاشـەگۆڕکێ دەکەن لە زنجیرەی لەدایکبوونی دووبارە، وهیچ ئاقڵێک نیە ئەم قسەیە بکات لەئەمڕۆدا!

سـەلـمێنراوە کە سـەردەمێک هەبووە گۆی زەوی هەر بوونی نەبووە لەبنچینەدا، وسـەردەمانێک هەبووە کە بوونەوەرە زینـدووەکـان لەسـەر زەوی بوونیـان نەبووە، وسـەردەمانێک هەبووە کە ژمارەی بوونەوەرە زیندووەکان بەم زۆریە نەبووە بەڵکو زۆر کەم بوون، پاشان زۆربوون لەگەڵ کاتدا وئەمە بەیەکدەنگی مرۆڤەکان لەئەمڕۆدا.

وسەردەمانێک هەبووە ژمارەی مرۆڤەکان زۆر کەمتر بووە لەم ژمارەیەی ئێستا.

---

[٢٢] Cogan, Robert. (١٩٩٨), Critical Thinking: Step by Step, University Press of America, (pp. ٢٠٢-٢٠٣).

ژمارەی مرۆڤەکـان جێگیر نیە ئەمە بەیەکـدەنگی، ئیتر چۆن لاشـــەگۆڕکێ لەنێوان ڕۆحەکان ڕوودەدات لە چەند بازنەیەکی جێگیردا؟

کێشـەی سـێیەم: بۆچی کەس نیە باسـی ژیانی پێشـوو بکات -لەدایکبوونی پێشـوو- کە گوایە لەوێوە هاتووە، جگە لەوانە نەبێت کە شوێنکەوتەی ئەو فەلسەفەن؟

ئافرەتێکی ئەمریکی هەبوو بەناوی روس سـیمنز Ruth Simmons، بانگەشـەی ئەوەی دەکرد ڕۆحی گۆڕاوە لەگەڵ لاشـەی ئافرەتێکی تر بەناوی بریدی مۆرفی Bridey Murphy پاشان روس سیمنز باسی یادگاریەکانی پێشووی دەکرد کاتێک مۆرفی لە سەدەی نۆزدە لە ئیرلەندا بوو، بەڵام کاتێک لێکۆڵەرەوان لە مەسەلەکە وردبوونەوە بۆیان دەرکەوت کە روس ســـیمنز دراوســـێیەکی کۆنی هەبووە لە ئیرلەنـدا بەنـاوی بریـدی مۆرفی، ویادگارییەکانی ژیانی ئەوی بردووە ســـەبارەت بە ئیرلەندا وبەناوی خۆیەوە باســـیانی کردووە، وبانگەشەی ئەوەی کردووە کە ئەو بریدیە.[٢٣]

بیرۆکەی لاشـــەگۆڕکێی ڕۆحەکان تەنها وەهم وخەیاڵە وپێچەوانەی ســـەرەتاییترین درککردنە بە ئەقڵ وهەست.

پۆل ئیدواردز سـەرۆکی سـەرنووسـەرانی فرەفەرهەنگی -ئینسـکلۆپیدیای- فەلسـەفی ومـامۆســـتـا لە زانکۆی نیویۆرک دەڵێـت: (لاشـــەگۆڕکێی ڕۆحەکـان تەنها خەیـاڵە وپێچەوانەی زانستی سەردەمە).[٢٤]

مرۆڤ ئەگەر بمرێت ئەوا لەدایک نابێتەوە لەم ژیانە لەلاشەی کەسێکی تردا.

وڤیدات بەردەوام جەخت لەســـەر ئەم هەقیقەتە دەکاتەوە، وشـــتێک نیە لە ڤیدات سەبارەت بە باسی لاشەگۆڕکێی ڕۆحەکان -تناسخ الأرواح- یان سەبارەت بە سامسارا.[٢٥]

---

[٢٣] وەسفکردنی حاڵی روس سیمنز: https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/١٢١١٦٦١٢ (وەرگیراوە لە وتارەکانی : د. فەوزی کوردی).

[٢٤] Edwards, Paul. (٢٠٠١), Reincarnation: A Critical Examination, Prometheus Books

[٢٥] Yuvraj Krishan: Bharatiya Vidya Bhavan, ١٩٩٧

هەتاوەکو زانای هیندۆسی شری ستیا کام ودیالنکار دەڵێــت: (بیروباوەڕی لاشەگۆڕکێی ڕۆحەکان لە ڤیدات نیە ومن تەحەدای هەرکەسێک دەکەم دەڵێت تێیدایە).[٢٦]

وباشترین بەڵگە لەسەر ڕاستێتی قسەی ودیالنکار ئەوەیە هیندۆسیەکان مەراسیمێکی ئـاینی دەکەن بەنـاوی : ( شـــرادە श्राद्ध Śrāddha ) وئـامـانجەکەی بریتی بوو لە هێورکردنەوەی ڕۆحی مردووەکان.

ئیتر چۆن لاشەگۆڕکێی ڕوودەدات لەکاتێکدا هیندۆسیەکان لەنێو ڕۆحی مردووەکاندان؟

وقورئانی پیرۆز کە خوای گەورە دایبەزاند بۆ سـەر پێغەمبەرەکەی موحەمەد -صـلی الله علیە وســـلم-، وەڵامی ئەوانەی داوەتەوە کە دەڵێن مرۆڤ لەم ژیانەدا دووبارە زیندوو دەبێتەوە، ئەویش هەر هەمان بیروباوەڕی ئەوانەیان هەیە کە دەڵێن:

﴿إِنْ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ﴾ واتە: ﴿ژیان تەنها ژیانی ئەم دنیایـــــەمانە و هیچی تر نیە، دەژین و دەمرین و ئێمە زیندوو ناکرێینەوە!!﴾[ســـورة المؤمنون: ٣٧].

خوای گەورە لە کتێبەکەیدا ڕەدیانی داوەتەوە:

﴿أَلَمْ يَرَوْا كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ الْقُرُونِ أَنَّهُمْ إِلَيْهِمْ لَا يَرْجِعُونَ﴾ واتە: ﴿ ئەوە ســـەرنجیان نەداوە چەندەها هۆزی پێش ئەمانمان لەناو بردووە، خۆ هەرگیز ناگەڕێنەوە ناویان و ناگەڕێنەوە بۆ دنیا﴾[سورة يس: ٣١].

هەرکەسێک بمرێت جارێکی تر ناگەڕێتەوە بۆ ئەم ژیانە یان گەڕانەوە بەشێوەیەکی تر.[٢٧]

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿لَا يَـــــذُوقُونَ فِيهَا الْمَوْتَ إِلَّا الْمَوْتَةَ الْأُولَىٰ﴾ واتە: ﴿لە هەمووی خۆشـــتر ئەوەیە کە هەرگیز تاڵی مردن ناچێژن تیایدا جگە لەو مردنەی یەکەمجار﴾[سورة الدخان: ٥٦].

[٢٦] ئواکمن : ل١٠٤، وەرگیراوە لەکتێبی : ( دعوة الهندوس إلى الإسلام )، دانەر: د. ئیبراهیم بن عبد الغفور بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامە دکتۆر، ( دار إيلاف للنشر والتوزيع) ، ل ٩٩.

[٢٧] قورتوبی لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: وئەم ئایەتە ڕەدە بۆ ئەوانەی بانگەشەی ئەوە دەکەن هەندێک لە خەڵکی دەگەڕێنەوە بۆ ژیان لەپاش مردنیان لەپێش هاتنی ڕۆژی قیامەت.

ئەمە بیروباوەڕی مسـولّمانانە، وئەمە بیروباوەڕی ڤیدایە کە بەداخەوە هیندۆسـیەکان وازیان لێهێناوە.

کێشـــەی چوارەم: ســـەبارەت بە لاشـــەگۆڕکێی ڕۆحەکان -تناســـخ الأرواح- ئەوەیە بانگەشـــەی ئەوە دەکەن مەبەســـت بریتیە لە گەیشـــتن بە قۆناغی یەکگرتنی ڕەها یان ئەوەی بە موکشا ناسـراوە، بۆ ڕزگاربوون لەم لەدایکبوونە دووبـــــارانە، وئەمیش مانای ئەوەیە لەدایکبوونە دووبارەکان سزا وئازارە.

بەڵام کێ دەڵێت لەدایکبوونە یەک لەدوای یەکەکان سزا وئازارە؟

زۆرینەی مرۆڤەکان ئەگەر پرســـیاریان لێبکرێت ئایا حەز دەکەیت جارێکی تر لەدایک ببیـت وژیـانێکی تر تـاقی بکەیتەوە ئەوا زۆرینەیـان بەبێ دوو دڵی دەڵێن بەڵێ حەز دەکەین.

پاشان ئەم تێڕوانینە شومیانە بۆ بوون لەسەر ئەوەی سزا وئازارە تێڕوانینێکی درۆینەیە؛ ژیان خێر ونیعمەتی زۆری تێدایە کە هەرگیز لە ژماردن نایەت.

موکشا بریتیە لە دەربازبوونێکی خەیاڵی لە شتێک کە بوونی نیە لەڕاستیدا !

کێشەی پێنجەم: سەبارەت بە فەلسەفەی لاشەگۆڕکێی ڕۆحەکان بریتیە لە گوێ نەدان بە کردنی تاوان وســـەرپێچیەکان، چونکە پاســـاو ئەهێندرێتەوە بۆ کردنی تاوانەکان، لەبەرئەوەی مرۆڤ دەربازبوون دەدۆزێتەوە لە لەدایکبوونەکانی پێشـــووتر ئەمیش بە لەدایکبوونی داهاتوو ؛ بۆیە با چێژ وەربگرێت لەم لەدایکبوونەی کە ئێستا تێیدایە.

ئەم بابەتە دەبێتە هۆی ئاســـایی بوونەوە وڕێگەپێدان بە کردنی هەر تاوانێک، ولەوەیە بەهۆی ئەمەوە بێت کە هیند خاوەنی بەرزترین ڕێژەی تاوان وتاوانی دەسـتدرێژی کردن بەدیاریکراوی.[٢٨]

وهیند لەو وڵاتانەیە کە خاوەنی بەرزترین ڕێژەی تاوانی دەستدرێژی کردنی بەکۆمەڵە.

---

[٢٨] https://en.wikipedia.org/wiki/Rape_in_India

## ٧- ئایا ســـەرچاوەی بیرۆکەی دووبارەبوونەوەی لەدایکبوونەکان ولاشەگۆڕکێی ڕۆحەکان چیە لە هیندۆسیەتدا؟

هیچ یەکێک نازانێت ئەم بیرۆکانە چۆن ســـەریان هەڵدا ونازانرێت کێ خاوەنیانە، وهەروەها بەڵگەش لەسەریان نیە.

وبەڵگە نیە لەسەر دووبارەبوونەوەی لەدایکبوونەکان لە ڤیدات، وتەنانەت یەک وشەش نیە ســـەبارەت بە لاشـــەگۆڕکـــــــێی ڕۆحەکان لە ڤیدات، وئەم بیرۆکانە تەنها لە فەلسەفەکانی پورانەکان Puranas هەیە کە لەم دواییانە سەریان هەڵدا.

دوور نیە لەوەی ئەم بیرۆکانە هاتۆتە نێو مێشـــکی یەکێک لەڕاهیبەکانی هیندۆس، وەکو جۆرێک لە خەیاڵکردنەوە بەهۆی زۆر مانەوە بەبێ خواردن وخواردنەوە هەروەکو لە مەراسیمەکانی پرانا Prana ڕوودەدات.

زانراوە کە مەراسیمەکانی پرانا دانیشتن بۆ ماوەیەکی زۆر لە خۆ دەگرێت بەشێوەیەکی دیاریکراو بەبێ خواردن وخواردنەوە.

مانەوە بەم شـــێوەیە بۆ چەندەها کاتژمێر بەشـــێوەیەکی دیاریکراو بەبێ خواردن وخواردنەوە، لەگەڵ کاتدا ئایۆنەکانی مێشـک بەهۆی کەمی گلۆکۆزی خوێن تێکدەچێت وکەموکورتی تێدەکەوێت ئەمیش دەبێتە هۆی دەردانی نارێکی هۆرمۆنی ئەندرۆفین بۆیە خەیاڵکردن -وەهم کردن:هەلوەسە- دەستپێدەکات لەڕاستیدا.[٢٩]

ئەوەی ڕاهیبەکان بینیوویانە ونووسـیوبانە لە پورانەکان سـەبارەت بە دووبارەبوونەوەی لەدایکبوونەکان ئەمە نزیکترە لە خەیاڵ وهەلوەسە یان بێهۆشی مێشکی.

ئەمیش بە دانپێدانانی زانستی سەردەم، چونکە بەپێی ناوەندی نیشتمانی ئەمریکی بۆ گەڕان وتوێژینەوە کە یەکێکە لە گەورەترین ســـەرچاوەکانی توێژینەوەی پزیشـــکی لە

[٢٩] https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/٨٩٣١٦٥١ ( ماڵپەڕی ناوەندنی نیشتمانی ئەمریکی بۆ توێژینەوە، کە ماڵپەڕێکی حکومیە ویەکێکە لە گەورەترین سەرچاوەکانی توێژینەوە وگەڕانی زانستی لەجیهاندا ).

جیهاندا ؛ کەمبوونەوەی گلوکۆز لە خوێندا بۆ ماوەیەکی زۆر بەم شــێوەیە دەبێتە هۆی خەیاڵ وهەلوەسە.[٣٠]

ئیمامی زەهەبـــی -ڕەحمەتی خوای لێبێت- دەڵێت: (پاشـان ڕاهیبی دوور لە زانسـت، هەرکـاتێـک زاهیـد بوو وژنی نەهێنا وبرســـی بووو، و وازی هێنا لە گۆشـــت وخواردنە خۆشـــەکان، وتەنها خواردنی خراپی خوارد، ئەوا بیرکردنەوەی نەفس تێکەڵی دەبێت وشـەیتان دەچێتە نێویەوە ودەردەچێت، بۆیە باوەڕی وادەبێت کە گەیشـتووە، وقسـەی لەگەڵ کراوە وبەرز بووەتەوە، بۆیە شــەیتان بەســەریدا زاڵ دەبێت و وەســوەســەی بۆ دەکات).[٣١]

بۆیە ئاینی ئیسـلام هۆشـداری داوە لە گوزەران بەم شـێوە قورس وناڕەحەتە و زۆرکردن لە نەفس بەم شێوەیە.

بەم شـــێوەیە نـاڕەحەت کردنی نەفس دەبێتە هۆی تێکچوون لە بیـــــرکردنەوەکان وخراپبوونی دینداری لەگەڵ کاتدا.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿قُـلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَـةَ اللَّـــــــهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَـادِهِ وَالطَّيِّبَـاتِ مِنَ الرِّزْقِ﴾ واتە: ﴿(ئـەی پێغەمبەر(صــلی اللە علیە وســلم) پێیان) بڵێ: ئەوە کێیە پۆشـــاک و زینەت و جوانیە خواییەکانی لە بەندەکانی حەرام کردوە کە لە بنەڕەتدا خۆی بۆی بەدیهێناون؟ هەروەها ئەوە کێیە ڕزق و ڕۆزیە چاك و پاکەکانی حەرام کردوە؟!﴾[الأعراف: ٣٢].

وپێغەمبەری خودا -صــلی اللە علیە وســـلم- دەفەرموێت: «بارگرانی مەخەنە ســـەر نەفسـتان؛ بۆیە خوای گەورەیش بارگرانی دەخاتە سـەرتان، خەڵکانێک بارگرانیان خسـتە سـەر نەفسـی خۆیان، بۆیە خوای گەورەیش بارگرانی خسـتە سـەریان ؛ ڕزگاربووەکانیان هان لە پەرستگا و دیرەکان،

[٣٠] سەرچاوەی پێشوو.

[٣١] سير أعلام النبلاء، ژیاننامەی: أحمد ابن أبي الحواري، لەماڵپەڕی: د.فوز كردي وەرگیراوە.

﴿وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ﴾ واتە: ﴿بەڵام ئـەوان ڕەهبانیەت و دوورەپەرێزیان لەدنیادا کردەپیشـەیان، وە نەبێت ئێمە ئەو حاڵەتەمان لەسـەر فەرز کردبن﴾.[الحدید: ٢٧]».[٣٢]

ئەم زیادەڕەویە بووە هۆی تووشبون بە ئەو هەلوەسە وخەیاڵانە کە پێچەوانەی ڤیدایە وئەمرۆ بووەتە یەکێک لە بنچینەکانی هیندۆسیەت.

و لەبەرامبەردا ئەگەر سـەیری موعجیزەکان بکەین کە خوای گەورە بەهۆیانەوە یارمەتی پێغەمبەرانی دا بۆ ســەرخســتنی پەیامەکەیان، موعجیزەکان لەناکاو ڕوودەدەن بەبێ ئـامـادەکـاری پێشــتر، وخەڵکی دەیبینن بەچـاوەکـانی خۆیـان، ومرۆڤەکـان نـاتوانن هاوشێوەی ئەمانە ئەنجام بدەن!

ئەمەیە جیـاوازی لەنێوان هەواڵپێـدانی پێغەمبەران وهەواڵپێـدانی ســەبارەت بە ئەو شتانەی ڕاهیبە هیندۆسیەکان بینوویانە.

## ٨- هیندۆسیەکان چۆن دەڕواننە گەردوون؟

بەپێی فەلسـەفەی هیندۆسـی گەردوون لەحاڵەتی تێکچوون وهەڵوەشـانەوەیە پاشـان جارێکی تر دەردەکەوێتەوە، بەم شێوەیە بەبەردەوامی.

گەردوون دروســت دەبێت پاشــان هەڵدەوەشــێتەوە پاشــان دروســت دەبێتەوە بەم شێوەیە بەبەردەوامی.

وئەم تێڕوانینە سەبارەت بە گەردوون کە هەڵدەوەشێتەوە ودووبارە دروست دەبێتەوە؛ هەڵەیەکی زانستیە.

لەڕوانگەی زانســتەوە لەپێش ئەم گەردوونە هیـچ گەردوونێکـی تر نەبووە، بەڵکو دروستکراوە وپێشتر هیچ نمونەیەکی نەبووە.

ئەمە بیروباوەڕی مسوڵمانانە کە پیاوێک دایمەزراندووە شوانێتی مەڕومالاتی کردووە لە نزیک مەککە بەرامبەر نرخێک بۆ خەڵکی مەککە ؛ لەپێش ١٤٠٠ ســاڵ بەناوی موحەمەد کوڕی عبداللە پێغەمبەری خودا وپێغەمبەری ئیسـلام -صـلى الله علیە وسـلم-، خوای

[٣٢] سنن أبي داود، صحيح : ٤٩٠٤ .

گەورە وەحی بۆ نارد بەوەی ئەم گەردوونە دروستکراوە وپێشتر هیچ نمونەیەکی نەبووە، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمویێت:

﴿بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَإِذَا قَضَىٰ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَــهُ كُن فَيَكُونُ﴾ واتە: ﴿(هەر ئەو زاتە) بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەویە بەجوانترین شێوە، جا هەر کاتێك بڕیاری هەر شتێك بدات، تەنها ئەوەندەی بەسە کە فەرمانی بوون یان پێشهاتنی بدات، ئیتر خێرا ئەو شتە، یان ئەو کارە، دەبێت و ئەنجام دەدرێت.﴾[سورة البقرة: ١١٧].

## ٩- لاشەی مرۆڤ لەچی پێکهاتووە لە هیندۆسیەتدا؟

لاشەی مرۆڤ لە هیندۆسیەتدا لە پێنج هێزی توخمی -ئەندامی- پێکهاتووە: ئاو و زەوی و هەوا و ئاگر و مەودا -بۆشایی ئاسمان-.

هەموو گەردوون وئەوەی تێیدایە لەم پێنج ماددەیەوە دروست بووە.

هەر توخمێک لەمانە لەبەرامبەریدا ئەستێرە هەیە، مەریخ ئاگرینە وزوحەل زەویە، وهەر ئەندامێک لە مرۆڤ لەبەرامبەریدا ئەم پێنج توخمە هەیە سپڵ زەویە ودڵ ئاگرینە.

هەموو شتێک لە بووندا پۆلێن دەکرێن بەپێی ئەم پێنج توخمە تانەت کاتەکانیش، بەپێی بیروباوەڕی ئەوان ؛ نەخۆشی بەهۆی تێکچوونێک لە تەرازووی ئەم پێنج توخمەوە ڕوودەدات.

وبیرۆکەی پێنج توخمەکە لە ڕێگەی پراناوە Prana سەریهەڵدا کە ئەمیش مەراسیمێکی خۆ برسیکردنە ودانیشتن وبێدەنگبوونە بۆ چەند کاتژمێرێکی زۆر.

بەداخەوە بیرۆکەی پێنج ئەندامەکە تەشەنەی کرد لە جیهاندا وزۆر لە زانستەکانی چارەسەرکردن بە وزە لەسەر ئەم بیرۆکەیە دامەزراوە.

بنچینەی زانستەکانی چارەسەر بە وزە وماکروبیوتک وفینج شوی وچارەسەر بە ڕەنگەکان وهتد لە ڕاهێنەکان لەسەر ڕێکخستنی ئەم ماددانە بنیات نراوە.

ڕێکخستنی ئەم توخمانە لەلای ئەوان دەبێتە هۆی هێنانی ڕزق ودوورخستنەوەی شەڕ وزیان.

ئەمڕۆ لە پەرستگا هیندۆسیەکان مرۆڤ دەشێلن بۆ ڕێکخستنی ئەم توخمانە، چونکە پێیان وایە ئەمە چارەسەری زۆر نەخۆشی دەکات.

وئەم بیرۆکەیە (بیرۆکەی پێنج توخمەکە) لە بنەڕەتدا هیچ پەیوەندیەکی بە زانستەوە نیە.

هەروەها پەیوەندی بە فیزیا وپزیشکیش نیە.

بەڵکو زانست حوکمی لەسەر ئەمە وئەو ڕاهێنانەی پەیوەندیان بەمەوە هەیە داوە ؛ بەوەی ئەمە جۆرێکە لە خورافەت وخەیاڵ وچەواشەکاری.

وئەم بیرۆکەیە وا پۆلێن کراوە بەوەی زانستێکی ساختەیە.[٣٣]

ئەو ڕاهێنان ومەشقکردنانەی پەیوەندیان بەم زانستەوە هەیە حوکمیان لەسەر دراوە بەوەی تەنها خەیاڵ و وەهمن.[٣٤]

لەوەیە بیرۆکەی پێنج توخمەکە هاتبێتە نێو مێشکی یەکێک لە ڕاهیبەکان بەهەمان ئەو ڕێگایەی کە لەدایکبوونە دووبارەکان ولاشەگۆڕکێی ڕۆحەکان هاتە نێو مێشکی ڕاهیبەکان، ئەمانە هیچ بەڵگەیەکی ئەقڵی وزانستی ومەنتیقی ودەقیشیان لەسەر نیە.

ئەم بیرۆکانە تەنها خەیاڵن.

کێشە لەوەدایە ئەو مەراسیمانەی پەیوەستن بەم بیرۆکەیەوە تەنها تەڵسیمی بتپەرستی وپەیوەست بوونە بە ئەستێرەکان وشێوە وهێما وڕەنگ وتەمیمەکان کە خوای گەورە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر دروستێتیان دانەزاندووە.[٣٥]

ئیسلام پێش زانستی سەردەم کەوتووە لە ئاگادارکردنەوە لەم مەشق ومەراسیمانە کە پەیوەستن بە بیرۆکەی پێنج توخمەکە، ئەم مەشق کردنانە دەبنە هۆی دواکەوتنی چارەسەر وەرگرتنی دروست، ودەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤ لە خەیاڵ و وەهمدا بژی پێچەوانەی ژیانی ڕاستی و واقیعی، ودەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤ پەیوەست بێت بە شت ویەکێکی تر جگە لە خوای گەورە، بۆیە ئیسلام هۆشداری داوە سەبارەت بەم مەشق

[٣٣] "Energy – (according to New Age thinking)", The Skeptic's Dictionary, ٢٠١١-١٢-١٩

[٣٤] "Some Notes on Wilhelm Reich, M.D", Quackwatch.org, ١٥-٠٢-٢٠٠٢

[٣٥] گفتوگۆم کردووە لەسەر بابەتی چارەسەر بە وزە لە کتێبێکی تر بە ناونیشانی: ( الإلحاد الروحي ) .

ومەراســـیمانە، خوای گەورە لە فەرموودەیەکی قودســـیدا دەفەرموێت:(بەیانی هات بەســـەر بەندەکانم وهەندێکیان باوەڕیان بە من هەیە وهەندێکیان کافرن بە من، ئەوەی ووتی: بارانمان بۆ باری بە فەزڵ ورەحمەتی خوای گەورە؛ ئەوە ئیمانداره بە من وکافره بە ئەســـتێره، وئەوەی ووتی: بارانمان بۆ باری بەهۆی دەرکەوتنی فڵان وفڵان ئەستێره ؛ ئەوە کافره بە من ؛ وئیمانداره بە ئەستێرەکان).[٣٦]

هەرکەســێک باوەڕی بە ئەســتێرەکان وکاریگەریان هەبێت لەســەر مرۆڤ وپێی وابێت ئەو ئەستێرانه کاریگەریان هەیە لەسـەررزق ورۆزیەکان ئەوە کافر بووە بە خوای گەورە، وهەرکەسێک باوەڕی بە خوای گەورە هەبێت ئەوا کافر بووە بە کاریگەری ئەستێرەکان لەسەر قەدەری مرۆڤ.

پێغەمبەری خودا -صـــلی الله علیه وســـلم- دەفەرموێـت: «(روقـاکـان - الرقی)* و(تەمیمەکان - التمائم)** و(تیوەلەکان - التولة)^ شـــیرکن -هاوبەش بڕیاردانن بۆ خوای گەورە-». *(روقـاکـان - الرقی): هەنـدێـك وتەن مـانـاکـانی نـازانرێـت کـە نـاوی شــەیتانەکان وهاوشــێوەی ئەوانەیە کە ســاحیرەکان ئەنجامی دەدەن. **(تەمیمەکان - التمائم): کاغەزێکە نووســـراوە ودەپێچرێتە ناو شـــتێك یان شـــتێکە (چاوەزارێکە) لە دەســت دەکرێت یان دەکرێتە ملەوە یان هەڵدەواسـرێت کە پێیان وایە لە چاوی پیس وشتی خراپ دەیانپارێزێت. ^(تیوەلەکان - التولة): زۆرجار ساحیرەکان ئەنجامی دەدەن بۆ ئەوەی دووکەس یەکیان خۆش بوێت یان بۆ ئافرەتان ئەنجامی دەدەن بۆ ئەوەی مێردەکانیان خۆشیان بوێن.[٣٧]

بۆیە مســـوڵمان باوەڕی نیە بە خوڕافەتی کاریگەری پێنج توخمەکە وتەڵســـیمەکان وتەمیمەکان کە پەیوەستن پێیان.

بەڵکو ئیســـلام جەخت لەســـەر ئەوە دەکاتەوە کە دروســـتکردنی تەڵســـیم وشـــێوە ئەندازەیەکان وبەندۆڵەکانی وزە وهتد لە شـتی پەیوەسـت بە پێنج توخمەکە ؛ حەرام و قەدەغەکراوە، وباوەڕ بەوەی ئەم تەڵســـیمانە هۆکاری ســـوود وزیانن ئەمە لەخودی خۆیدا شیرک وکوفرە بە اللّٰه.

---

[٣٦] صحیح مسلم:٧١.

[٣٧] صحیح الجامع: ١٦٣٢.

پێغەمبەر -صـــلى الله عليه وســـلم- ئەڵقەیەکی مســـی لە دەســـتی پیاوێکدا بینی، فەرمووی: ئەمە چییە؟ پیاوەکە ووتی: بۆ لابردنی نەخۆشـی لاوازی لە دەستم کردووە. -صـــلى الله عليه وســـلم- فەرمووی: «داییکەنە تەنها لاوازترت دەکات، ئەگەر بمریت وئەمە لە دەستدا بێت؛ ئەوا دەرێیتە دەستی».[٣٨]

وله گێڕانەوەیەکدا: «ئەگەر مردیت وئەم شـــتە لەدەســـتت بێت ئەوا هەرگیز ســـەرفراز نابیت».[٣٩]

شـــێخی ئیســـلام ئیبن تەیمیە -ڕەحمەتی خوای لێبێت- دەڵێت: «-باوەڕبوون بەوەی- دروســتکردنی تەڵســیمەکان دەبێتە هۆی هێنانی ســوود ودوورخســتنەوەی زیان ئەمە شیرکی گەورەیە».[٤٠]

ئەمە هەمان بیروباوەڕە کە بهاغافاد غیتا भगवद्गीता Bhagavad Gītā جەختی لەســەر دەکاتەوە کە دەڵێت: (ئەوانەی خوایەکان دەپەرســـتن دەگەن بە خواکان، وئەوانەی پێشین دەپەرستن دەگەن بە پێشین، ئەوانەی شەیتان دەپەرستن دەگەن بە شەیتان، ئەوانەی من دەپەرستن دەگەن پێم).[٤١]

هەرکەسـێک پەیوەسـت بێت بە جگە لە الله لە پەیوەسـت بوون بەم تەڵسـیمانە ئەوا جگە لە خوای گەورەی پەرستووە.

چارەنووسی بەپێی ڤیدا بەهەتاهەتایی مانەوەیە لە دۆزەخدا، یجر ڤیدا دەڵێت: (ئەوەی جگە لە خوای گەورە دەپەرســـتێت لە شـــتە دروســـتکراوەکان، ئەوا نقوم دەبێت لە تاریکایی وسزای ئاگر دەچێژێت بۆ هەتاهەتایی).[٤٢]

پەروەردگارمان -سبحانه وتعالى- دەفەرموێت:

---

[٣٨] صحيح ابن حبان: ٦٠٨٥.

[٣٩] سەحیحە لە گێڕانەوەی الهيتمي المكي، الزواجر، ب١ ل١٦٦.

[٤٠] مجموع الفتاوى، ٩ : ل ٣٤.

[٤١] بهاغافاد غیتا، ٩-٢٥.

[٤٢] يجر فيدا، سوكت:٤٠، منترا:٩.

﴿بَل لِّلَّـــــهِ الْأَمْرُ جَمِيعًا﴾ واتە: ﴿بەڵام دڵنیابن کە هەموو کارێك و هەموو شـــتێك بەدەست خوایە﴾ [سورة الرعد: ٣١].

پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: «وئەگەر داوات کرد ئەوا تەنها داوا لە خوای گەورە بکە، وئەگەر داوای یارمەتیت کرد ئەوا تەنها لە خوای گەورە داوای یارمەتی بکە».[٤٣]

بۆیە مسوڵمان باوەڕی بە خوڕافەتی کاریگەری پێنج توخمەکە وئەستێرەکان وتەڵسیم وتەمیمەکان نیە، بەڵکو باوەڕی وایە ئەمانە لەخودی خۆیاندا بتپەرســتی وگومڕایی وچەواشەکاری وخوڕافەتن.

## ١٠- ئایا کۆمەڵگەی هیندۆسی چۆنە؟

کۆمەڵگەی هیندۆسی بەهۆی باوەڕبوونی بە بیرۆکەی لاشەگۆڕکێی ڕۆحەکان وبیرۆکەی کارما ؛ کۆمەڵگەیەکی چینایەتیە.

چونکە مرۆڤی خراپ جارێکی تر لەدایک دەبێتەوە لەم ژیانە لە چینێکی کەمتر لەوەی پێشووتری.

بۆیە ئەوەی تووشی ناخۆشی وتاقیکردنەوە بوو شایستەی ئەو ئازار وناڕەحەتیەیە...

ئەمە دانانی بناغەیە بۆ ســـتەم بەرامبەر هەژار وئەوانەی تووشـــی تاقیکردنەوە بوون وگرنگی نەدانە پێیان.. ئەمە ڕازی بوون وئاسایی کردنەوەی ستەم وسنوور تێپەڕاندنە.

لە هیندۆسیەتدا مرۆڤەکان دابەش دەبن بەسەر چوار چین:

١- براهیمنەکان: مامۆستا وقەشەکان.

٢- کشاترياکان: جەنگاوەر وپاشاکان.

٣- ڤیشیەکان: جووتیار وبازرگانەکان.

٤- شودراکان: کرێکارەکان.

[٤٣] سنن الترمذي، صحيح: ٢٥١٦ .

وکەمترین چین بریتین لە: شودراکان کە بەچاوی سووک سەیر دەکرێن وئیشی پیس دەکەن -لەڕوانگەی ئەوانەوە- وەکو پاکوخاوێنی وخزمەتگوزاری.

چینی هەر مرۆڤێک جۆری کارەکەی وپۆشاکەکەی وخواردنەکەی دیاریدەکات.

وهاوسەرگیری لە چوارچێوەی یەک چیندا ڕوودەدات.

مرۆڤ بڕیاری لەسەر دراوە بەوەی خۆی بداتە پاڵ ئەو چینەی کە تێیدا لەدایکبووە هەتاوەکو دەمرێت.

ئەم تێڕوانینە چینایەتیە هەڵقوڵاوە لە باوەڕ بە بیروباوەڕی لاشەگۆڕکێی ڕۆحەکان وبیروباوەڕی کارما، شودراکان شایستەی ئەوەن کە لەو چینە بن، چونکە بێگومان لە لەدایکبوونەکانی پێشوو گوناهبار بوونە، بۆیە لەدایکبوونە لەو چینە.

ئەم تێڕوانینە هەڵە و شێواوە دەبێتە هۆی تێکچوونی ژیان بەتەواوی، بەم تێڕوانینە دەکرێت یارمەتیدانی چینی شودراکان جۆرێک لە ڕێز نەگرتن بێت لە کارما.

ئەمە جۆرێکە لە ئاسایی کردنەوەی دواکەوتن وستەم وچینایەتی وسنوور تێپەڕاندن.

فەلسەفەی لاشەگۆڕکێی ڕۆحەکان وفەلسەفەی کارما ئەم چینایەتیەی هێنایە کایەوە، وئەم تێڕوانینە هەڵەیان دروستکرد بۆ خەڵکانێکی هەژار ونەخۆش ولاواز کە هیچ شتێکیان بەدەست نییە.

هیندۆسیەت هەلی یارمەتیدان ودرێژکردنی دەستی هاوکاری بۆ ئەوانەی بەهەدەردا.

ئەم تێڕوانینە هیندۆسیانە پێچەوانەی فیترەتی سروشتی مرۆڤە، ئەو فیترەتەی دەبێتە هۆی هەست وسۆز بەرامبەر لاواز وهەژار ونەخۆشەکان، وهەروەها دەبێتە هۆی هەستکردن بە ئەرک بەرامبەریان لە خزمەتکردن وهەوڵدان بۆ لادانی ئازار وناڕەحەتی لەسەریان.

نازانم چۆن هیندۆسیەکان دوورکەوتوونەتەوە لە بیروباوەڕی ئیمان بە ڕۆژی دوایی کە لە ڤیدا هاتووە، ئەو بیروباوەڕە دەبێتە هۆی چاکبوونی ژیانی مرۆڤ وتێڕوانینی بۆ جیهان دەگۆڕێت، لێپرسینەوە لە مرۆڤ بەدەست خوای گەورەیە لە ڕۆژی قیامەتدا، وهەموو مرۆڤەکان بە بێ تاوانی لەدایک دەبن، ودرێژکردنی دەستی یارمەتی بۆ لێقەوماوەکان لە خەڵکی دەبێتە بەرزبوونەوەی پلەی مرۆڤ لای خوای گەورە لە قیامەتدا.

کام لەم دوو تێڕوانینە باشتر وچاکترە بۆ مرۆڤایەتی ونزیکترە لە سروشتی مرۆڤ؟

فەلسەفەی کارما .. یان بیروباوەڕی ڤیدات؟

لە ریج ڤیدا هاتووە: (ئەی اللە تۆ بەباشترین شێوە پاداشتی کەسی چاک دەدەیتەوە).[٤٤]

هەروەها تێیدا هاتووە: (بۆ هەتاهەتایی بمهێڵەرەوە لەو شوێنەی کە هەموو جۆرەکانی چێژ وخۆشی تێدایە، کە تێیدا مرۆڤ ئەوەی پێدەدرێت کە نەفسی حەزی لێیەتی).[٤٥]

ئەمە بیروباوەڕی ڤیدایە.

لەوێ بەهەشت هەیە کە چاکەکاران نیعمەتیان پێدەبەخشرێت.

هەر لەوێ بەپێی ڤیدا سزادان هەیە کە ئامادەکراوە بۆ تاوانباران.

ریج ڤیدا دەڵێت: (شوێنێکە بنی زۆر قوڵە بۆ تاوانباران ئامادەکراوە).[٤٦]

چۆن دەبێت ئەم شوێنانە بگونجێت لەگەڵ بیروباوەڕی دووبارەبوونەوەی لەدایکبوونەکان و لاشەگۆڕکێی ڕۆحەکان؟

ئایا شوێنێکی قوڵ بۆ تاوانبارەکان لەچی شوێنێکی فەلسەفەی کارما جێی دەبێتەوە؟

بۆیە فەلسەفەی کارما بەشێوەیەکی گشتی داهێنانی مرۆڤە وتێڕوانینێکە پێچەوانەی ڤیداتە.

بیروباوەڕی هەموو پێغەمبەران بریتی بوو لە : باوەڕهێنان بە ڕۆژی دوایی وبەهەشت ودۆزەخ، ومرۆڤ بە بەریئی وبێ تاوان لەدایک دەبێت.

وئەم بیروباوەڕە دەگونجێت لەگەڵ فیترەت، وپێچەوانەی ستەم ودواکەوتن وچینایەتی وسنوور بەزاندنە.

---

[٤٤] ریج فیدا، مندل:١، سکوت:١، منترا:٦.

[٤٥] ریج فیدا، مندل: ٩، سوکت: ١١٣، منترا: ٩-١١.

[٤٦] ریج فیدا، مندل: ٤، سوکت: ٥، منترا: ٥.

ئـاینی پێغەمبەران هەوڵـدەدات بۆ پـایەدار کردنی مرۆڤ وبەرزکـــــــردنەوەی پلەکـانی، وبانگەوازی دەکـات بۆئەوەی خەڵکی بە یەکســـانی ودادپەروەری مـامەڵەیـان لەگەڵدا بکرێت.

بەهای مرۆڤ لە ئیسـلامدا لە چین وشـێوە وباری تەندروسـتی وئاسـتی ئابووری نییە بەڵکو بەهای مرۆڤ بەپێی ئەو کردەوە چاکانەیە کە ئەنجامی دەدات.

ئیسـلام بانگەوازی دەکات بۆ بەرزکردنەوەی پلەوپایەی هەمووان وپشـتگوێ خسـتنی ڕەچەڵەک وپلەی کۆمەڵایەتیان.

بەڵکو بیرۆکەی بەچاوی سـووک سـەیرکردنی چینێک لە خەڵکی وچینایەتی زۆر بەتوندی ڕەت دەکاتەوە.

خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُـعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّـهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّـهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ واتە: ﴿ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە هەمووتانمان لەنێرو مێیەک دروسـتکردووە (کەباوکەئادەم و دایکە حەوایە) و کردوومانن بەچەندەها گەل و تیرە و هۆزی جۆربەجۆر، تا یەکتر بناسـن و پەیوەندیتان خۆش بێت بەیەکەوە... بەڕاسـتی بەڕێزترینتان لای خوا ئەو کەسـانەتانن کەزۆرتر لەخواترسـەو فەرمانبەرداری خوایە، بێگومان خوا زانا و بە ئاگایە لە هەمووان﴾[سورة الحجرات: ١٣].

وپێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: (هەرکەسێک کردەوەی دوای بخات، ئەوا ڕەچەڵەکەکەی پێشی ناخات).[٤٧]

هەروەها پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: (نابێت خەڵکی بێن بۆ لام بە کردەوەکانیانەوە، وئێوە بێن بۆ لام بە ڕەچەڵەکەکانتانەوە).[٤٨]

ڕەچەڵەک لە ئیسلامدا هیچ نرخ وکێشێکی نیە بەو تێڕوانینەی ئەوان بۆی.

وپێغەمبەر -صـلى الله عليه وسـلم- دەفەرموێت: (ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان یەکە، وباوکتان یەکە، بەدڵنیاییەوە، هیچ عەرەبێک فەزڵی نیە بەسەر نـــاعەرەبێکەوە، وهیچ

[٤٧] صحيح مسلم: ٢٦٩٩.

[٤٨] حسنه الوادعي في الصحيح المسند : ١٤٢٦.

ناعەرەبێک فەزڵی نیە بەسەر عەرەبێکەوە، وهیچ سپی -پێستێک- فەزڵی نیە بەسەر ڕەش -پێستێکەوە-، وهیچ ڕەش -پێستێک- فەزڵی نیە بەسەر هیچ سپی -پێستێکەوە- ؛ مەگەر بە -پێی پلەی- تەقواداری نەبێت).[49]، وپێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت:(لاوازەکانم بۆ بانگ بکەن، ئێوە ڕۆزیتان پێدەدرێت وسەردەخرێن بەهۆی لاوازەکان لەنێوتان).[50]

سەیری ئەم وێنەیە بکە: (لاوازەکانم بۆ بانگ بکەن، ئێوە ڕۆزیتان پێدەدرێت وسەردەخرێن بەهۆی لاوازەکان لەنێوتان)، وبەراوردی بکە لەگەڵ ئەو وێنەی هیندۆسیەت تێی دەڕوانێت سەبارەت بە لاوازەکان.

نەفسی مرۆڤ خوڵقێنراوە لەسەر هەست وسۆز بەرامبەر لاواز وهەژار وسادە وئەقڵ ناکامڵەکان لە خەڵکی، دژایەتی کردنی هیندۆسیەتی ئێستا بۆ ئەم فیترەتە لەڕاستیدا کێشەیەکی گەورەیە.

## ١١- ئایا ڕاستە هیندۆسیەکان مانگا بەپیرۆز دادەنێن؟

مانگا لە هیندۆسیەتدا پیرۆزیەکی تایبەتی هەیە چونکە سەرچاوەی بەخشینە، وهەروەها مەسەلەیەکی تر هەیە ئەویش تێڕوانینی هیندۆسیەتی سەردەمە کە پەیوەندی هەیە بە بابەتی تێکەڵبوونی خوا لەگەڵ خوڵقێنراوەکان لەنێویشیان مانگاکان کە ناسراوە بە فەلسەفەی (یەکگرتنی خوا لەگەڵ خوڵقێنراو : -یەکگرتنی بوون- وحدە الوجود)، مانگا چەند شێوەیەکی جیاوازی بەپیرۆزدانانی هەیە لە هیندۆسیەتدا.

بەردەوام ئاهەنگی تایبەتی دەکرێت بۆ مانگاکان لە شوێنی جیاوازی هیند.[51]

لە بەرامبەردا ڤیدات خوای گەورە بە پاك وبێگەرد دادەنێت کە ئەو دوورە لە هەموو کەموکورتیەک و بەمەزنی دادەنێت لەسەرووی هەموو شتێک ودروستکراوێکەوە.

[49] رواه البيهقي في شعب الإيمان والحديث صحيح، السلسلة الصحيحة : ٢٧٠٠.

[50] سنن أبي داود والترمذي وصححه الألباني في صحيح الجامع وصحيح أبي داود : ٢٥٩٤.

[51] أسطورة البقرة المقدسة، دويجندرا نارايان (وەرنەگێڕدراوە).

هاتووە لە ریج ڤیدا: (من اللە م بوونم هەبووە لەپێش هەموو شتێک، ومن خاوەنداری هەموو جیهانم، ومن نیعمەت بەخشەری ڕاستەقینەم وبژاردەی هەموو نیعمەتەکانم، دەبێت هەموو ڕۆحەکان بانگی من بکەن بۆ یارمەتیدان وڕۆزی بەخشین).[52]

ئەمە دەقێکی ڕوونە وەکو خۆر نکۆڵـــــی دەکات لە بیرۆکەی (یەکگرتنی خوا لەگەڵ خوڵقێنراو : -یەکگرتنی بوون- وحدە الوجود)، خوای گەورە خوڵقێنەری جیهانە وجیاوازە لە جیهان.

هەروەها ئەم دەقە هۆشـــداری تێدایە لە بەپیرۆزدانانی جیهانی ماددی یان داوای بەهاناوە هاتن وپاڕانەوە لە خوڵقێنراوەکان، بۆیە نابێت مرۆڤ نزا بکات وبپاڕێتەوە وداوای بەهاناوە هاتن بکات لە هیچ کەسێک مەگەر لە خوای گەورە کە مانگا وهەموو شتێکی تری خوڵقاندووە -سبحانە وتعالی-.

بیروباوەڕی تەســلیم وملکەچبـــــوون تەنها بۆ خوای گەورە ناوەڕۆکی بیروباوەڕی ئیسلامیە.

ئـــاینی ئیسلام جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە مانگا وهەموو شـتێکی ماددی لە دەوروپشتمان بۆ ئێمە موسەخەر وڕامکراوە، وخوای گەورە بە فەزڵی خۆی خوڵقاندوونی، خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿وَسَـــخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّـــمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ واتە: ﴿هەرچی لە ئاســمانەکان و زەویدا هەیە بۆ ئێوەی ڕام هێناوە، بۆ خزمەتگوزاری ئێوە فەراهەمی هێناوە، هەموویشـــی تێکڕا بەخشـــشـــن لەلایەن ئەو زاتەوە، بەڕاستی ئا لەو بەخشش و دیاردانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆرهەن بۆ کەسانێك کە بیربکەنەوە و تێفکرن.﴾[سورة الجاثیة: ١٣].

ئەمە بیرباوەڕی ئیسلامە وفیترەتی مرۆڤە.

هیندۆسی ناتوانێت بگەڕێتەوە بۆئەوەی ڤیدا لەسەری بووە لە تەوحید وملکەچبوون بۆ خوای گەورە مەگەر لەڕێگای ئاینی ئیسلامەوە نەبێت، ئیســلام وتاربێژی هەموو هەق وڕاســتیەکە کە لە ڤیدا هەیە وئیســلام هەموو هەڵەکانی مرۆڤ ڕاســت دەکاتەوە،

[52] ریج فیدا، مندل:١٠، سوکت:٤٨، منترا:١.

ونکۆڵی دەکات لە هەموو دەســتکاری وگۆڕانکاریەکی وەحیەکانی خوای گەورە کە لایەن مرۆڤەوە کراوە.

## ١٢- بەڵام هیندۆسیەت شتێکی زۆری تێدایە لەخۆ بێبەشکردن لە خۆشیەکان وهەوڵەکانی دووربوون لە تاوان، ئایا ئەمە سیفەتێکی چاک نیە ؟

پێشــتر ئاماژەم بۆ زۆر زیادەڕەوی کرد لە هیندۆســیەتدا، بەڵام لێرەدا ئەوەی دەمەوێت بیڵێم ئەوەیە چزەی تاوان وســەرزەنشــتکردنی ویژدان ئەمانە شــتێکن پەیوەندیان بە تەکلیفی خودایی هەیە.

چونکە ئێمە ئەرکی شــەرعیمان لەســەرە -تەکلیفمان لەســەرە- بۆیە هەســت بە ســەرزەنشــتکردنی ویژدان دەکەین لەکاتی کردنی هەرســەرپێچیەک ئەگەر گوناهێکی بچووکیش بێت.

ئەمە فیترەتە، خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿فِطْرَتَ اللَّـــهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا﴾ واتە: ﴿خەڵکینە ئێوەش پابەندی ئەو نەخشــەو فیترەتە بن کە خوا ئێوەی لەسەر دروست کردووە﴾[سورة الروم: ٣٠].

بەهۆی ئەم فیترەتەوە، مرۆڤ هەست بە چزەی ویژدان دەکات ئەگەر هەر سەرپێچیەک بکات کە پێچەوانەی بەهاکانی خێر وهەق بێت.

خــــوای گەورە -عز وجل- لە کۆتا پەیامدا -ئیسلام- ڕێنموێنی کردووە بۆ ڕێگای داوای لێخۆشــبوون وتەوبە کردن لە تاوان وســەرپێچیەکان کە پێچەوانەی خێر وهەقن، وهەروەها خوای گەورە فەرمانی کردووە بە گێڕانەوەی مافەکان بۆ خاوەنەکانیان وبەم شێوەیە خوای گەورە لە گوناهەکان خۆش دەبێت.

بەڵام دەبینین لە هیندۆســیەتدا ڕێگای تر هەیە بۆ بەرەنگاربوونەوەی تاوان ئەویش بریتیە لە زیادەڕەوی کردن لەســەر نەفس، لەگەڵ کۆمەڵێک لە ڕاهێنان ومەراســیم وخەیاڵکردنەوە ومەشــقی بێدەنگ بوون کە بۆ ماوەیەکی زۆر بەبێدەنگی دەمێننەوە ودادەنیشن.

## ١٣- ئایا بێدەنگبوونی گشـــتی ودانیشـــتنەکانی خەیاڵکردن لە هیندۆسیەتدا شتێکی باش نیە؟

خەیاڵکردنەوە وتێڕامان لە هیندۆســیەتدا وەکو دانیشـــتنەکانی یۆگایە کە دواتر لە فەلسـفەی پرانا Prana دەرکەوت: ئەمە بیرکردنەوە نیە لە خوڵقێنراوەکانی خوای گەورە وحیکمەتی، وتێڕوانین نیە بۆ کاملی خوڵقاندن وحیکمەت ونیعمەتی.

بەڵکو بیرکردنەوە لای ئەوان بریتیە لە جۆرێک بێدەنگبوونی گشـتی وبەتاڵکردنی مێشـک لە هەموو شتێک سەرقاڵی بکات.

بێدەنگبوونێکی گشــتیە وەکو بێدەنگبوونی مردووەکان کە وەســتانی مێشـک وئەقڵە لە بیرکردنەوە Silence your Mind During Yoga .

وئەم دانیشـتنە تێڕامانە بێدەنگبوونە سـەیرانە کە دەرکەوت لەپاش سـەردەمی ڤیدات، کاریگەری هەبوو لەســـەر بیرکردنەوەیان وتووشـــی خەیاڵکردنەوە وهەڵوەســـە بوون، وشەیتانەکان یاریان بە ئەقڵیان کرد.

هەندێکیان پێیان وایە زانسـتیان بەدەسـت هێناوە لەم ڕێگایەوە، وئەوەی ڕوویدا تەنها هەڵوەســـە وخەیاڵکردنەوە بوو بەهۆی تێکچوون لە ئایۆنەکانی مێشـــک لەئەنجامی نەخواردن وبێدەنگبوونی گشتی هەروەکو پێشتر باسمکرد.[٥٣]

خەیاڵکردن بە بێدەنگبوونیەکی درێژ وبرســـێتیەکی زۆر دەبنە هۆی تووشـــبوون بە ئەم هەلوەســـەیە، وئەوەی دان بەمەدا دەنێت یەکێک لە بەناوبانگترین دامەزرێنەرەکانی قوتابخانەی خەیاڵکردنەوە بەبێدەنگبوونە لە جیهاندا بەناوی میکاو ئوســـوی Mikao Usui .

دان بەوەدا دەنێت خەریکە مێشـکی لە دەســت دەدات وتووشــی هەڵوەسـە وخەیاڵی سـەیر دەبێت لەپاش دانیشـتن بۆ کاتژمێرێکی زۆر بەبێ خواردن وخۆبێبەشکردن، ولەم ساتانەدا تووشی خەیاڵکردنەوەی سەیر دەبوو.[٥٤]

---

[٥٣] https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/٨٩٣١٦٥١

[٥٤] الريكي للمبتدئين، ديفيد إف فينلس، ل ٣٠-٣٥، وەرگیراوە لە (التطبيقات المعاصرة لفلسفة الاستشفاء الشرقية، د.هيفاء بنت ناصر الرشيد).

وزانـای نەخۆشـــیە دەروونیەکـان بەنـاوی دونوڤـان راکیلف Donovan Rawcliffe لە توێژینەوەیەکدا باســی ئەم خەیاڵکردنانەی کرد کە دێنە نێو ئەقڵی مرۆڤ پاش ئەم مەراســیمانە ودەڵێت ئەمە هیچ جیاوازیەکی نیە لەگەڵ وەهم وخەیاڵی نەخۆشــی کە بەهۆی هەڵوەسەوە تووشی مرۆڤ دەبێت.[٥٥]

سەرەڕای ئەوەی پێشوو دانیشتنەکانی یۆگا لەڕوانگەی تەندروستیەوە ڕەخنەی لێگیراوە، چونکە بەردەوامبوون لەســەری دەبێتە هۆی پەشــۆکان وپشــێوی ولەدەســتدانی هەستکردن بە کات وشوێن، وئەمە دەبێتە هۆی لاوازکردنی بیرکردنەوە و تووشبوون بە زەهایمەر.[٥٦]

هیندۆســیەت بەم مەراســیمانە دوورکەوتەوە لە ڤیدات ودوورکەوتەوە لە ڕێنمایی پێغەمبەران.

ئاینی ئیســلام بانگەوازی دەکات بۆ بیرکردنەوە وتێڕامان لە خوڵقێنراوەکانی اللە، وئەم بیرکردنەوە وتێڕامـــانە دەبێتە هۆی کردەوەکردن وسـوپاسـگوزای وبەمەزنداناني خوای گەورە وگوێڕایەڵبوونی وکۆششکردن لەژیانی دونیا، نەوەک ببێتە هۆی بێدەنگبوون وکپ کردنی مێشک کە هیچ بیرکردنەوەیەکی لەگەڵدا نەبێت.

بیرکردنەوە وتێڕامانی هەق وڕاســت دەبێتە هۆی گوێڕایەڵبوونی خوای گەورە وگەڕانەوە بۆ لای ئەو زاتە،

﴿الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّـهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَـٰذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾ واتە: ﴿ئەوانەی یادی خوا دەکەن لەکاتێکدا کە بەپێوەن یان دانیشـتوون یان ڕاکشـاوون (لە هیچ حاڵەتێکدا یادی ئەوزاتە فەرامۆش ناکەن)، هەمیشــە بیردەکەنەوە لە دروســت بوونی ئاســمانەکان و زەوی (بیردەکەنەوە لە هەموو وردەکاریەک، سەرنجی هەموو دیاردەیەک دەدەن، سەرئەنجام دەڵێن): پەروەردگارا تۆ ئەم هەموو دروســت کراوانەت بێ هودە و بێ ئامانج دروســت

[٥٥] Rawcliffe, Donovan, (١٩٨٨), Occult and Supernatural phenomena, Dover Publications (p. ١٢٣)

[٥٦] An introduction to complementary medicine, Simon Borg Olivier (p. ٢٩٠) ; (وەرگیراوە لە: حركة العصر الجديد، د.هيفاء بنت ناصر الرشيد).

نـــەکردووە، پاکیی و بێگەردیی شـایسـتەی تۆیە، دە تۆش بمانپارێزە لە سـزای ئاگری دۆزەخ.﴾[سورەتی آل عمران: ١٩١].

ئەمە ئەو تێڕامانەیە کە ئیسـلام پێی هاتووە ودەگونجێت لەگەڵ سـروشـتی مرۆڤ ویارمەتیدەری مرۆڤە بۆ سـوپاسـکردنی نیعمەتەکانی خوای گەورە کە دەوری داوە وسوپاسکردنی پەروەردگار لەسەر ئەم نیعمەتانە.

سـەبارەت بە دانیشـتنەکانی بێدەنگبوونی تەواو لە هیندۆسـیەتی ئێسـتادا گەرماوی شـەیتانن، شـەیتانەکان هەندێک بینین وخەیاڵیان پێ نیشـان دەدەن لەو دانیشـتنانەدا بۆیە تووشـی ئەو بیرۆکانە دەبن وەکو لەدایکبوونە دووبارەکان وبیرۆکەی لاشـەگۆڕکێی ڕۆحەکان ویەکگرتنی خوا لەگەڵ بوونەوەر -وحدة الوجود- وبیرۆکەی بەرجەسـتەبوونی خوا لە بتەکاندا بۆیە ڕاهیبەکان ئەم شتانە فێری شوێنکەوتووانیان دەکەن وگومڕا دەبن وئەوانیش گومڕا دەکەن.

## ١٤- چی هەڵەیەک هەیە لە بە تەنیا مانەوە لە شـوێنە پیس وچۆڵەکان هەروەکو لە هیندۆسـیەتی ئێسـتادا ئەم مەراسـیمە هەیە؟

هینـدۆسـیەت دژی غەریزە وچێژ وشـەهوەتە نەک لەڕوانگەی ڕێکخسـتنی وەکو شـەریعەتی ئیسـلام بەڵکو لەڕوانگەی سـوتاندنی لاشـە، هیندۆسـیەت لەئێسـتادا مرۆڤ ڕادەکێشێت بەرەو ڕەهبانیەت وجیابوونەوە و وازهێنان لەدونیا.

هیندۆسیەت وا دەڕوانێت بۆ لەبیرکردنی شەهوەت وغەریزە دەبێت لاشە لەبیر بکرێت.

بۆیە ئەو هیندۆسیەی دەیەوێت موکشا بێت -ڕزگاری بێت- دەچێت بەرەو شوێنە پیس وچۆڵەکان بۆئەوەی لاشـەی پیس بێت، وهەموو ژیانی بە سـواڵکەری بەڕێوە دەبات هەتاوەکو دەمرێت.

ئەمیش هەڵەیەکی کارەساتبارە دەبێتە هۆی وێرانبوونی مرۆڤ وخێزان وکۆمەڵگا.

غەریزە وشـەهوەت بەخشـینێکی خوداییە بۆ پێکهێنانی خێزان ودامەزراندنی کۆمەڵگا و بۆئەوەی مرۆڤ هەوڵبدات وژیان دابمەزرێنێت.

شەهوەت چارەسەر دەکرێت بە ڕێکخستنی ودانانی لەشوێنی سروشتی خۆی، نەک بە سوتاندنی لاشەکە.

کێ وتوویەتی ئامانج لە ژیانی ئێمە ئەوەیە ســوالْ بکەین بۆ ژەمە خواردنێک پاشـــان هەموو ڕۆژەکە لە شوێنێکی پیس وچۆڵ بەسەر ببەین هەتاوەکو دەمرین؟

کێ وتوویەتی ئێمە هاتووین بۆ ئەم جیهانە بۆئەوەی پارچە قوماشێکی زەعفەرانی لەبەر بکەین پاشان خۆمان جیا بکەینەوە لە جیهان هەتاوەکو دەمرین؟

بچووکترین مێرووەکان لە ئێمە زیاتر ئاگادارن لە ئەرکی بوون وئاوەدان کردنەوەی زەوی و چاکسـازی لە ژیاندا، دەبینیت ڕەوە هەنگەکان بە کۆشـش و ڕێک و پێک کاردەکەن بۆ سوودی خۆیان وسوودی نەوەکانیان، بە هەمان شێوە بەکتریا وورده‌کان لە ڕیخۆڵەکاندا ڕێکخراون بەجۆرێک کە سوود وەربگرن و سوود ببەخشن.

وژیان بەشێوەیەکی گشتی لەسەر یاسا وڕێکخستەیەکی تایبەت بەڕێوە دەچێت.

هیندۆسیەتی ئێستا بانگەوازی دەکات بۆ دەست بەتاڵی وپشتگوێ خستن وسواڵکردن، سواڵکردن لە هیندۆسیەت بووەتە مەنهەجی ژیان.

پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە: مانای چیە هیندۆسـی لە خەڵکی جیا بێتەوە، ولە سـەر شاخ وشــوێنە دوورەکان بمێنێتەوە دوور لە شــوێنی نیشـــتەجێبوونی خەڵکی، ئایا ئەمە چی سوودێکی دەبێت بۆ خەڵکی؟

ئـــــاینی هەق وڕێبازی ژیانی ڕاسـت ودروسـت ئەوەیە بە جدی کار بکەیت وئامۆژگاریکار بیت وتێکەڵ بیت لەگەڵ خەڵکی وهەوڵ بدەیت بۆ چاککردنی کاروبار وحاڵیان وئارام بگریت لەسەر ئازاردانیان، نەک لێیان دوور بیتەوە بۆ کێو وبیابانەکان !

پێغەمبەری خودا -صلی الله علیه وسلم- دەفەرموێت: (ئەو مسوڵمانەی تێکەڵ دەبێت لەگەڵ خەڵکی وئارام دەگرێت لەسـەر ئەزیەت وئازاردانیان خێرترە لەو مسـوڵمانەی کە لەگەڵ خەڵکی تێکەڵ نابێت وئارام ناگرێت لەسەر ئەزیەت وئازاردانیان).[٥٧]

---

[٥٧] صحيح سنن الترمذي : ٢٥٠٧.

## ١٥- ئایا چاکترین ڕێگا کامەیە بۆ بەرەنگاربوونەوەی شەهوەت وخۆ دەرباز کردن لە گوناهـ وتاوانەکان؟

بنچینەی بەرەنگاربوونەوەی شەهوەت وغەریزە بنچینەیەکی فیتری وتەکلیفیە، ومسوڵمان پابەند دەبێت بە ڕێکخستنی شەهوەتی بەو پێیەی وەحی خودایی فەرمانی پێکردووە.

هاوسەرگیری چاك هەیە، وچاو پاراستن هەیە لەئاست سەیرکردنی نامەحرەم، وتەقوا وترسان لە خوای گەورە لە نهێنی وئاشکرا، وهەڕەشەی خودایی هەیە لە کردنی گوناهـ وتاوانەکان.

وڕێگا هەیە بۆ تەوبە کردن ئەگەر مرۆڤ هەڵەی کرد ونەفسی لاواز بوو.

بەڵام لە هیندۆسیەتدا دەبینین کەسێکی هیندۆسی کە دەیەوێت بگاتە موکشا -دەربازبوون- ؛ واز دەهێنێت لە خێزان ومنداڵەکانی وپیشەکەی و لەسەر شۆست ولە شوێنە پیس وچۆڵەکان دەخەوێت وسواڵ دەکات بۆ بەدەستهێنانی ژەمێک خواردن، وبەردەوام دەبێت لەسەر سوتاندنی لاشەی بەم شێوەیە هەتاوەکو دەمرێت، ئایا ئەمە ڕێگایەکی چاکە بۆ پاککردنەوەی نەفس؟

ڕاهیبە هیندۆسیەکان کە ئەمڕۆ لە هیندستان ژمارەیان زیاتر لە ٥ ملیۆن کەسە؛ نەک هەر ئەوانەی لە ژێر چاودێری خۆیاندان پشتگوێیان دەخەن، بەڵکو خۆیان دەبنە وابەستە و پێویستیان بە کەسێک دەبێت کە خۆراکیان پێبدات و چاودێرییان بکات.

ئاینی ئیسلام نەفسی مرۆڤی بە باشترین و بەحیکمەتترین شێوە پاڵاوتە کردووە وپاکی کردووەتەوە.

ئیسلام جەختی لەسەر ئەوە کردووەتەوە کە کەمتەرخەمی پیاو بەرامبەر ئەوانەی ئەرکی دابینکردنی خەرجی لەسەریانە ؛ حەرامە، پێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: «بەسە بۆ مرۆڤ هێندە گوناهبار بێت کە ئەو کەسانە پشتگوێ بخات کە -لەسەریەتی-خەرجیان بۆ دابین بکات».[٥٨]

[٥٨] صحيح سنن أبي داود، صحيح : ١٦٩٢.

پاشـــان ئیســـلام جەختی لەســـەر ئەوە کردووەتەوە کە چاککردنی نەفس وپاڵاوتنی وپاککردنەوەی بە ئەنجامدانی کردەوە چاکەکان و بەرەنگاربوونەوەی شـــەهوەت دەبێت بەبێ ئەوەی لە دونیا دابڕێت، لە ئیســـلامدا مرۆڤ دەتوانێت لە کۆمەڵگاکەیدا بژی و وبنیادی بنێت و لەهەمان کاتدا ڕزگاری بێت لەلای خوای گەورە بەبێ ئەوەی پێویســـت بکات جەستەی خۆی بەم شێوەیە بسوتێنێت وەک لە ئایینی هیندۆسیدا دەبینرێت.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَىٰ * بەڵام ئەوەی لە پایەو شـــکۆی پەروەردگاری ترســـابێت و حیســـابی بۆ کردبێت و جڵەوی نەفســـی گرتبێتەوە لە هەموو هەواو هەوەس و ئارەزوویەکی نادروســـت..(٤٠) فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَىٰ * بێگومان هەر بەهەشت جێگەی مانەوە و حەوانەوە و گوزەرانیەتی(٤١)﴾[سورة النازعات].

ترســـان لە خوای گەورە وئەنجامدانی کردەوە چاکەکان ڕێبازی چوونە بەهەشـــتە، ئەگەرچیش لە یەکێک لە کۆشکەکان بژیت لە ژیانی دونیا.

پاڵاوتن وپاککردنەوەی نەفس مەرج نیە بە سوتاندنی لاشە ونارەحەتکردنی بێت، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿فَلَا اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ * کەچی (زۆربەی ئەو خەڵکە) نەیتوانی بەســـەر کۆســـپ و لەمبەرەکاندا زاڵ ببێت و ڕێگای سەرفەرزای بگرێتەبەر (١١) وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ * جا تۆ چووزانی ئەو کۆسپ و لەمپەرانە کامەن؟! (١٢) فَكُّ رَقَبَةٍ * ئازاد کردنی بەندە و کۆیلەیە (یان ئازادکردنی گەردنی خۆیەتی لە گوناهو یاخی بوون و سەرکەشی) (١٣) أَوْ إِطْعَامٌ فِي يَوْمٍ ذِي مَسْغَبَةٍ * یاخود خۆراک بەخشینە لە ڕۆژێکدا کە گرانی و پرسێتی هەبێت. (١٤) يَتِيمًا ذَا مَقْرَبَةٍ * بەتایبەتی بەو هەیتوەی کە خزمایەتی هەیە لەگەڵیدا (١٥) أَوْ مِسْكِينًا ذَا مَتْرَبَةٍ * یان بە هەژارێک کە لە هەژاریدا لەسەر خاک دانیشێت، یان پەککەوتە و کەفتەکارێک. (١٦) ثُمَّ كَانَ مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ وَتَوَاصَوْا بِالْمَرْحَمَةِ * ســـەرەڕای ئەوانـــەش ئادەمیزاد دەبێت لەوانەبێت کە باوەڕیان هێناوە و ئامۆژگاری یەکتریان کردووە لەســـەر خۆگری و ئارامگری و هەروەها ئامۆژگاری یەکتریان کردووە لەســـەر ڕەحم و بەزەیی و میهرەبانی. (١٧) أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْمَيْمَنَةِ * (ئەوانەی بەو سیفەتە جوانانە خۆیان دەڕازێننەوە) ئەوانە دەستەی ڕاست و -دەستەی بەختەوەرانن- (١٨)﴾[سورة البلد].

بۆئەوەی چوونە بەهەشـــت بەدەســـت بهێنیت دەبێت کۆیلە ڕزگار بکەیت وخواردن ببەخشـــیت بە هەژارەکان وکردەوەی چاک ئەنجام بدەیت وئامۆژگاری خێر بکەیت بۆ خەڵکی.

بەم شێوەیە ڕزگارت دەبێت.

نەک بەوەی خۆت لە خەڵکی داببڕیت وسواڵ بکەیت بەدرێژایی ژیانت!

## ١٦- بۆچی ئاینی ئیسلام هیندۆسیەت ڕەت دەکاتەوە؟

هیندۆســـیەت ئاین ومەزهەب وڕەوتێکی بیروباوەڕی نیە، بەڵکو بووە بە تێکەڵەیەک لە ڤیـدات لەگەڵ فەلســـەفە وڕێنمـایەکـانی ڕاهیبەکـان وتـانترای بـاتینی، وهەروەها ئەو مەراسیمانەی کە بێ سنوورن.

بۆیە هیندۆســـیەت چیتر ڕێکخســـتەیەکی لاهوتی پەرســـتنی نیە، یان ڕێکخســـتەیەکی مەراسیمی دیاریکراو لەشێوەدا نیە، یان مەنهەجێکی ئاینی جێگیر نیە، یان پێکهاتەیەکی ئاینی ناوەندی نیە کە هەموو هیندۆســـیەکان کۆ بکاتەوە، ئەمڕۆ هیچ شـــتێک لەمانە نابینیت لە هیندۆســـیەتدا، تۆ ئێســـتا لەپێش هەزارەها کۆمەڵی ئاینی جیاوازیت کە لەڕوانگەی لاهوتیەوە تەواو جیاوازن![59]

چۆن دەتوانین خوای گەورە بپەرستین بە شـتێکی شـێواو وناڕێکی وەکو ئەمە کە خوای گەورە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر دانەمەزراندووە؟

وچۆن دەتوانین ئەم تێکەڵە شـــێواو وناڕێکە لە تێڕوانینەکان ؛ بکەین بە مەبەســـت وئامانج لە ژیاندا؟

پاشان بڕوانە چۆن هیندۆسیەکان لەئێستادا بتەکان دەپەرستن چونکە پێیان وایە خوا تێیدا بەرجەستە دەبێت !

[59] الهندوس: معتقدهم الديني وممارساتهم، جوليوس ج. ليبنر، ل ٨.

ئەوانەی بتەکان دەپەرستن ودەڵێن خوا تێیاندا بەرجەستە بووە یان دەڵێن بە پەرستنیان لە خوا نزیک دەبینەوە، خوای گەورە -عز وجل- وەسفیانی کردووە بەوەی کافر وبێباوەڕن، خوای گەورە -سبحانە وتعالی- دەفەرموێت:

﴿أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰ إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ﴾واتە: ﴿بێداربە ئاینی (گەردنکەچی) پاك و خاوێن هەر بۆ خوایە وە کەسانێك جگە لە (خوا) چەند پەرستراوێکیان بۆ خۆیان داناوە (دەڵێن) تەنها لەبەر ئەوە دەیان پەرستین نزیکمان بکەنەوە لە خوا بێگومان خوا بڕیار دەدات لە نێوانیاندا لەو شتانەدا کەئەوان تیایدا جیاواز بوون بەڕاستی خوا ڕێنمونی کەسێك ناکات کە درۆزنی زۆر بێ باوەڕە﴾[سورة الزمر: ٣].

هیندۆسەکان بە پەرستنی ئەم بتانە دژایەتی ڤیدات دەکەن، هەروەکو پێشتر باسمکرد، وپێچەوانەی فیترەتی سروشتی خۆیانن، چونکە دەزانن کە خاوەنی هیچ بەڵگەیەکی فیترەتی نین بۆ پشتگیری کردن لەم بت پەرستیە وباوەڕبوون بە بەرجەستەبوونی خوا تێیاندا.

﴿أَمَّن يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَإِلَـٰهٌ مَّعَ اللَّهِ قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ واتە: ﴿ئایا کێ لە سەرتاوە دروستکراوان بەدی دەهێنێت، پاشان دوای تێکدانی سەرلەنوێ دروستی دەکاتەوە، کێ لەو ئاسمانەوە (بەهۆی تیشکی خۆر و باران و هەواوە) لە زەوییەوە (بە هۆی خاکەوە) ڕزق و ڕۆزیتان پی دەبەخشێت؟، ئایا ڕەوایە لەگەڵ زاتی خوادا خوای تر هەبێت؟، پێیان بڵێ: ئادەی بەڵگەتان چییە بیهێننە مەیدان ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن﴾[سورة النمل: ٦٤].

چۆن دەتوانن بەڵگە بهێننەوە!

ناتوانن هیچ بەڵگەیەک بهێننەوە!

کێشەی هیندۆسیەت لەئێستادا ئەوەیە بت پەرستی زۆر بەگەورە دادەنێن ودەیکەن بە پایەیەک لە پایەکانی ئاینەکەیان.

بت لە هەموو شوێنێک هەیە.

پێیان وایە خوا بەرجەستە دەبێت لە بتەکاندا.

هەزارەها شێوە لە بت و وێنە و هێما هەیە لە هیندۆسیەتدا.

هیندۆسیەت ئێستا ئاینی بت پەرستی و نەخشەکێشانی مرۆڤ وهێماداریە.

هەروەها هیندۆســیەتی ئێســتا باوەڕیان بە : یەکگرتنی خوا لەگەڵ خولٌقێنراو -وحدة الوجود- هەیە.

هینـدۆســیەتی ئێســتـا پێیـان وایە: جیهـان ئەزەلیە -بوونی هەبووە لەڕابردوو وبێ سەرەتایە-.

هەروەها بناغەیە بۆ دامەزراندنی چینایەتی.

هیندۆســیەتی ئێســتا باوەڕیان وایە خوا بەرجەســتە دەبێت لە مرۆڤدا، پێی دەڵێن: (ئافاتار).

وپێیان وایە خوا بەرجەستە دەبێت لە بتەکاندا وپێی دەڵێن: (شاکتی).

هیندۆسیەتی ئێستا باوەڕیان بە : لاشەگۆڕکێی ڕۆحەکان -تناسخ الأرواح- هەیە.

وباوەڕیان بە : دووبارەبوونەوەی لەدایکبوونەکان هەیە.

وباوەڕیان بە : پێنج توخمەکە هەیە وئەوەیشــی پەیوەندی پێیانەوە هەیە لە تەڵســیم وتەمیمە وپەیوەست بوون بە جگە لە الله.

بەهۆی هەموو ئەم شــتانەوە ئـــاینی ئیســلام هیندۆســیەت ڕەت دەکاتەوە، چونکە پێچەوانەی ڕێنمایی پێغەمبەرانە وتەوحید -یەک خوا پەرستی- پشتگوێ خستووە.

ئاینی ئیســلام بانگەوازی هەموو هیندۆســیەک دەکات بۆ گەڕانەوە بۆ لای الله لەڕێگای ئاینی ئیسلامەوە، هیچ دەربـــازبوونێک نیە لەلای الله مەگەر بە پەیڕەوکردنی ئیسلام نەبێت.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ﴾ واتە: ﴿ئاینی ڕاست لای خوای گەورە ئیسلامە﴾[سورەتی آل عمران: ١٩].

وپەروەردگار دەفەرموێت:

﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ واتە: ﴿و هەرکەسێک ئاینێکی تر پەیڕەو بکات جگە لە ئیسلام هەرگیز لێی قبوڵ ناکرێت لە قیامەتیشدا لە دۆڕاوەکان دەبێت﴾[سورەتی آل عمران: ٨٥].

هەروەها دەفەرموێت:

﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا﴾ واتە: ﴿ئەمڕۆ ئایینەکەتانم تەواو (کامڵ) کردووە بۆتان و چاکە و بەهرەی خۆم بەتەواوی ڕشتووە بەسەرتاندا و ڕازی بووم کە ئیسلام ئایینتان بێت﴾[سورەتی المائدة: ٣].

بۆیە هیچ ڕزگاربوونێک نیە بۆ هیندۆسی وبۆ هیچ مرۆڤێک مەگەر بە پابەندبوون بەم ئاینەوە نەبێت... ئاینی ئیسلام.

ئیسلام لە نێو ئایینەکانی تردا تەنها ئایینێک نییە، بەڵکو تاکە ئایینی تەوحیدیە -یەک خوا پەرستیە- کە خوای گەورە هەموو پێغەمبەرانی پێ ناردووە، هەموو پێغەمبەران ئەرکی بانگهێشتکردنی خەڵکییان بۆ تەوحید پێ سپێردرابوو، هیچ ئاینێک لەسەر ئەم تەوحیدە پاکە لە ئەمڕۆدا نەماوە جگە لە ئاینی ئیسلام، لەکاتێکدا ئاینەکانی دیکە پشکی خۆیان لە شیرکدا هەیە، چ بچووک یان گەورە بێت.

ئیسلام ئەوەیە کە بەتەنها خوای گەورە بپەرستیت بێ پەرستنی هیچ شتێک یان کەسێکی تر لەگەڵ ئەو زاتە، پابەندی فەرمانەکان بیت ودوور بکەویتەوە لە نەهی لێکراوەکان وبوەستیت لەسەر سنوورە شەرعیەکان، باوەڕ بە هەموو ئەو شتانە بکات کە باسیکردووە لەوانەی ڕوویداوە یان ڕوودەدات، وخۆ بەریئکردن لە هەموو پەرستنێک بۆ بت و وێنە وهێماکان.

خوای گەورە -سبحانە وتعالى- دەفەرموێت:

﴿سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ واتە: ﴿پاکی و بێگەردی بۆ پەروەردگارت، پەروەردگاری خاوەن دەسەڵات، لەوەی کە ئەوانە دەیدەنە پاڵ ئەو زاتە بێ هاوەڵ و هاوتایە﴾[سورەتی الصافات: ١٨٠].

بەپاکدانانی خوای گەورە لەوەی هیندۆسیەکان وەسفی دەکەن لە بەرجەستەبوونی لە بتەکاندا.

﴿وَسَـــلَامٌ عَلَى الْمُرْسَـــلِينَ﴾ واتە: ﴿ســـڵاو درووديش لـەســـەر هـەموو پێغـەمبـەران خوا﴾[سورەتی الصافات: ١٨١].

ســـەلام لەســـەر ئەو پێغەمبەرانەی کە خەڵکی دەناســـێنن بە پەروەردگاریان، وبەپاکی وبەرزی دادەنێن لە هەموو کەموکورتیەک.

## ١٧- بۆچی واجبە لەسەر هەموو هیندۆسیەک مسوڵمان بێت؟

جگە لەوەی ئیسلام ئەو ئاینەیە کە خوای گەورە بۆ بەندەکانی پەسەندی کردووە و تاکە شــەریعەتی ئیلاهییە کە لەلایەن پەروەردگارمانەوە قبوڵ کراوە، کتێبە هیندۆســییەکان کە ڕەنگە هەندێک پاشــماوەی پێغەمبەرایەتیان تێدا مابێت، چەندین موژدەیان تێدایە ســەبارەت بە هاتنی ئیســلام و پێغەمبەرەکەی موحەمەد -صــلى الله عليه وســلم-، ئەمەش هۆکارێکی بەهێزە بۆ ئەوەی هیندۆســـی مســـوڵمان بێت ودوو دڵ نەبێت لە تاکە ڕێبازی ڕزگاربوون لەلای خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا.

باسی هەندێک موژدە دەکەم لە کتێبە هیندۆسیەکان سەبارەت بە ئاینی ئیسلام.

بەڵام پێش باسکردنی ئەم موژدانە لە کتێبی هیندۆسیەکان پێم باشە باسی یاساکانی هیندۆسیەت بکەم وچۆن هیندۆسی لاشەی دەسوتێنێت بۆئەوەی پاک بێتەوە.

وچۆن هیندۆسیەکان چەند مەراسیمێکی سەخت وزبری ناسروشتی جێبەجێ دەکەن.

حــاڵی ئەوان دوور نیە لە حــاڵی جولەکە وگــاوڕەکــان (ئەهلی کیتــاب)، چونکە ئەوان بەتایبەت جولەکەکان زۆر شـــتیان لەســـەر یاســـاغ کرا بوو لەڕوانگەی پاک وخاوێنی وخواردنەکانەوە، وهەروەها شــتی تریان لەســەر یاســاغ کرابوو بەتایبەت ئەوەی تایبەتە بە حوکمەکان کە فەرز کرا لەسەریان بەهۆی ستەم ودەستدرێژی وخراپەکاریان.

خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرمویت:

﴿فَبِظُلْمٍ مِّنَ الَّذِينَ هَادُوا حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَاتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَـدِّهِمْ عَن سَـبِيلِ اللَّـــهِ كَثِيرًا﴾ واتە: ﴿بەهۆی زوڵم و ستەم لــەلایەن ئەوانەی کە بوونەتە جوو و بەهۆی ئەوەی کە زۆر کۆســـپیان دەخســـتە بەر ڕێبازی خوا، ئێمە هەندێک نازو نیعمەتمان لێ حەرام کردن کە پێشتر بۆیان حەڵاڵ بوو﴾[سورة النساء: ١٦٠].

بەسـە کە (سـفر اللاويين) بخوێنیتەوە لە تەوراتدا کەباسـی حوکمی سـوڕی مانگانەی ئافرەتی جولەکە دەکات، تەورات دەڵێت: (هەر شـتێک لە کاتی سـوڕی مانگانەدا لەسـەری پاڵبکەوێت، پیس دەبێت، هەرشـتێک لەسـەری دابنیشـێت، پیس دەبێت، هەرکەسێک دەست لە جێگاکەی بدات، دەبێت جلەکانی بشوات و بە ئاو خۆی بشوات، تا ئێوارە پیس دەبێت، جا جێگاکە بێت یان هەر شتێک کە لەسەری دانیشتبوو، کاتێک کەسـێک دەسـتی لێدا، تا ئێوارە پیس دەبێت، ئەگەر پیاوێک لەگەڵیدا پاڵ بکەوێت و سـوڕی مانگانەی بڕوات و -پیاوەکە- دەسـت -لەلاشـەی- بدات بۆ ماوەی حەوت ڕۆژ پیس دەبێت، هەر جێگایەک لەسەری پاڵ بکەوێت پیس دەبێت).[٦٠]

ئەم هەموو حوکمە قورسە بەهۆی وشکی وتوندڕەوی بەنی ئیسرائیل وڕەقی دڵیان بوو.

وخوای گەورە لە تەوراتدا باسـی ئەوەی کردووە، کە پێغەمبەرێکیان بۆ دەنێرێت کە ئەم حوکمە قورسانەیان لەسەر لادەدات.

لەکاتی سـەرەمەرگی پێغەمبەر یەعقوب -عليه السـلام- تەورات پێمان دەڵێت کە ئەو دوانزە کوڕەکەی کۆکرەوە و وەسـیەتیانی کرد، ولە وەسـیەتە بەناوبانگەکەی یەعقوب کە لە تەوراتدا هاتووە، تەورات دەڵێت:

یەعقوب کوڕەکانی بانگکرد وفەرمووی: کۆببنەوە بۆئەوەی هەواڵتان پێبدەم سـەبارەت بەوەی بەسـەرتان ڕوودەدات لە داهاتوودا، کۆببنەوە وجوان گوێ بگرن ئەی نەوەکانی یەعقوب بۆ باوکتان ئیسـرائیل...پاشـان بە یەهوزای ووت، ویەهوزا باپیری پێغەمبەران: داود وسـولەیمان ومەسـیحە -عليهم الصـلاة والسـلام-. پێی ووت: گۆچانی میرایەتی ودەسـتەی فەرمانڕەوایەتی جیا نابێتەوە لە یەهوزا هەتاوەکو شـیلۆن دێت وگەلەکان گوێڕایەڵی دەبن).[٦١]

ئەم دەقە بەبێ هیچ ناکۆکیەک لەنێوان ئەهلی کیتاب موژدەیەکی گرنگ وزۆر گەورەیە!

موژدەیە سـەبارەت بە کەسـێک کە دێت وپێغەمبەرایەتی بۆ ئەو دەگوازرێتەوە وحوکم وشەریعەت دانان بۆ ئەو دەگوێزرێتەوە.

[٦٠] سفر اللاويين، إصحاح ١٥، الأعداد ٢٠-٢٤.

[٦١] سفر التكوين، إصحاح: ٤٩، الأعداد: ١-٢ و١٠.

(گۆچانی میرایەتی جیا نابێتەوە لە یەهوزا): مەبەســـت لێی ئەوەیە نەوەکانی یەهوزا دەبنە پێغەمبەر وفەرمانڕەوا.

(هەتاوەکو شیلۆن دێت وگەلەکان گوێڕایەڵی دەبن).

شـــیلۆن کێیە کە یەعقوب -علیە الســـلام- موژدەی هاتنی داوە کە گەلەکان گوێڕایەڵی دەبن؟

پێش ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە دەبێت بزانین کە کۆتـــا پێغەمبەری بەنی ئیسرائیل مەسیح بوو -علیە السلام-، ولە نەوەی یەهوزایە.

پاشان لەناکاو پێغەمبەرایەتی وەستا لە نەوەی ئیسرائیلدا !

بەپێی موژدەپێـدانەکەی یەعقوب، وا گریمان دەکرێت کە حوکمڕانی و پێغەمبەرایەتی و یاسادانان بۆ کـەسێکی دیکە دەگوازرێتەوە لە دەرەوەی نەوەکانی یەهوزا دوای وەستانی پێغەمبەرایەتی لە نێو بەنی ئیسرائیلدا، ئایا ئەمە ڕاست نییە؟

زۆر ڕوونە کە ئەم کەسە مەسیح نیە، چونکە مەسیح لە نەوەی یەهوزایە !

وئەم کەسـە ئومەتەکەی فەرمانڕەوایی خاکی یەهوزا دەگرنە دەسـت بەپێی موژدەکەی یەعقوب (گۆچانی میرایەتی ودەســـتەی فەرمانـــــڕەوایەتی جیا نابێتەوە لە یەهوزا هەتـاوەکو شـــیلۆن دێـت وگەلەکـان گوێڕایەڵی دەبن) ؛ ئومەتی ئەم پێغەمبەرە فەرمانڕەوایەتی خاکی فەڵەســتین دەگرنە دەســت، وگەورەترین ئیمپراتۆریەتەکان دێنە ژێر فەرمانڕەوایی ئومەتەکەی !

عومەری کوڕی خەتاب -ڕەزای خوای لێبێت- لە خیلافەتەکەیدا فەرمـــانڕەوایەتی خاکی یەهوزا وشام وعێراق وخاکی فارسەکانی گرتە دەست بەهۆی ئیسلامەوە.

ئەمە هەقیقەتە وهیچ پێویست بە بیرکردنەوە ولێکدانەوە ناکات!

مێژوو پێمـان دەڵێـت ئەو موژدەیەی کە لە ئـامۆژگـارییەکـانی یەعقوبدا بۆ منداڵەکـانی هاتووە، بەڕاستی بەدی هات، و هیچ پێغەمبەرێکی دیکە جگە لە موحەمەد -صلى الله عليه وسلم- ناگرێتەوە، و ڕووی نەدا بەو وردەکاریانەوە بەسەر هیچ ئومەتێک جگە لەو ئومەتەکەی ئەو !

بەڵام وشەی (شیلۆن) مانای چیە؟

شـــیلۆن: واتا ئیســـراحەت -پشـــوو- بەخش یان لابەری کۆت وزنجیرەکان ؛ ئەمە ئەو مانایەیە کە پەسەندترینە لە ماڵپەڕەکانی خـوێندنەوەی کتێبیەکان تایبەت بە سەردەمی کۆن (تەورات).[٦٢]

یەعقوب -علیه الســلام- موژدە دەدات بەو کەســەی کە کۆت وزنجیرەکانیان لەســەر لادەدات کە لەسەریان بوو.

کەواتە با ئەم ئایەتە بخوێنینەوە کە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُــولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَــعُ عَنْهُمْ إِصْــرَهُمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ﴾ واتە: ﴿ئەوانەی کە شـــوێنی ئەم پێغەمبەرە (موحەمەد -صـــلی اللە علیە وســـلم-) هەواڵدەرە نەخوێندەوارە دەکەون ئەوەی کە (گاورو جوو، ناوو نیشـــانیان) دەســـتیان دەکەوێت نووســـراوە لای ئەوان لە تەورات و ئینجیلدا، فەرمانیان پێدەدات بەچاکەو قەدەغەی گوناهو خراپەیـان لێدەکات و هەرچیەک پاکو چاکە بۆیان حەڵاڵ دەکات و هەرچی پیس و ناپوختە لێیان حەرام دەکات و ئەرکە قورس و سـەنگینەکان لەسـەرشـانیان لادەبات، ئەو کۆت و زنجیرانەش کە لەسەریان بوو لای دەبات (وەک خۆ کۆشتن لەکاتی تەوبەدا... هتد)﴾[سورة الأعراف: ١٥٧].

(وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ : ئەو کۆت و زنجیرانەش کە لەسەریان بوو لای دەبات (وەک خۆ کۆشتن لەکاتی تەوبەدا... هتد) : شەریعەتی ئیسلامی لێبوردە وئاسانکار هات بۆ لابردنی ئەو کۆت وزنجیرانە.

ئێستا با بچینەوە بۆ سەر کتێبی هیندۆسیەکان.[٦٣]

---

[٦٢] https://www.christiancourier.com/articles/١١٠١-who-is-the-mysterious-shiloh Rest-giver or peace-bringer
http://www.abideinchrist.com/messages/gen٤٩v٨.html Shiloh is the man of rest, the giver of rest or rest-bringer

[٦٣] باسی موژدەکەی یەعقوب -علیه السلام-م کرد لەپێش باسکردنی موژدە هیندۆسیەکان چونکە بەڵگەیەکی جیاوازە لەسەر ڕاستێتی ئاینی ئیسلام لە دەرەوەی ئیسلام.

هیندۆسیەت لەلایەنێکی ترەوە هەروەکو بــاسمانکرد ؛ پڕە لە مەراسیمە سەختەکان بۆ سوتاندنی شەهوەت بۆ پاکبوونەوە لە گوناهەکان.

کتێبە هیندۆسیەکان موژدە دەدەن بە هاتنی پێغەمبەرێکی مەزن کە ئەو قورسییانەیان لەسەر لادەدات ولە گوناهەکانیان پاکیان دەکاتەوە.

کتێبە هیندۆســـیەکان دەڵێن: (کالکی لەدایک دەبێت لە دوانزەی دەرکەوتنی مانگ لە مانگی مادهو).[٦٤]

(کالکی) واتا: پاککەرەوە لە گوناهەکان.

(ومانگی مادهو): مانگی -ربیع-ە کە خۆشەویستە لای نەفسەکان.

پێغەمبەری داهـاتووە کە لە گونـاهەکـان پـاکیـان دەکـاتەوە لە دوانزەی مـانگی -ربیع- لەدایک دەبێت.

وپێغەمبەر موحەمەد -صـلی الله علیە وسـلم- هەروەکو زانراوە لەلای زۆرینەی زانایانی مسوڵمان لە دوانزەی مانگی -ربیع الأول- لەدایکبووە.[٦٥]

سـەبارەت بە شـوێنی لەدایکبوونی -صـلی الله علیە وسـلم- لە کتێبە هیندۆسـیەکاندا هاتووە : (کالکی لەدایک دەبێت لە گوندی شـــمهبل، لەگەڵ خزمەتکارانی ماڵەکە، لە ماڵی پیاوێک بەناوی وشنویاش).[٦٦]

گوندی (شمبهل) مانای: شارە ئاسایشەکە -بێ ترسەکە-.

شارە ئاسایشەکە ؛ شاری مەککەیە :

﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَـٰذَا بَلَدًا آمِنًا﴾ واتە: ﴿(یادی ئەوە بکەنەوە) کاتێك ئیبراهیم دۆعــای کردو وتی: پەروەردگارا دەوروبەری ئەم ماڵەت بگێڕە بەشارێکی پڕ لە ئاسایش و ڕزق و ڕۆزی هەمەجۆر ببەخشە بەدانیشتوانی﴾[سورەتی البقرة: ١٢٦].

---

[٦٤] کالكي بران، أدهياي:٢، شلوك:١٥.

[٦٥] صحيح السيرة النبوية، محمد بن ناصر الألباني، ل ١٣، وەرگیراوە لە کتێبی : (دعوة الهندوس إلى الإسلام)، پەیامی دکتۆرا لەئامادەکردنی : د. إبراهيم عبد الغفور، ل ١٩٨.

[٦٦] کالكي بران، أدهياي:٢، شلوك:٤.

وپێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- لە مەککە لەدایکبووە.

وکاتێک دەڵێت: (لە ماڵی پیاوێک بەناوی وشـنویاش) ؛ وشەی وشنویاش واتا : (عبدالله - بەندەی خوا).

دایکی ئەم پێغەمبەرە ناوی (ســومتی)یە : (کالکی لەدایک دەبێت لە ماڵی وشــنویاش وخێزانەکەی سومتی).[٦٧]

وشەی (سومتی) لە ئاسایش -ئەمن-ەوە هاتووە، واتا: ئامینە.

زانراوە کە موحەمەدی کوڕی عبدالله -صلى الله عليه وسلم- دایکی ناوی ئامینەیە.

بەپێی هیندۆسـیەت کالکی لە گوندێکەوە دەردەکەوێت بەناوی شـمبهل، ودەجەنگێت دژی شـەیتان وتاریکی وخراپەکاری وتاوان لەناو دەبا، پاشـان بۆ ئەو شـوێنە دەگەڕێتەوە لەکۆتایی تەمەنی، وپاشان خوای گەورە بۆ ئاسمان بەرزی دەکاتەوە.

وهەموو مســوڵمـانێک ئەم هەقیقەتە دەزانێت، پێغەمبەر موحەمەد کوڕی عبـدالله -صـلى الله عليه وسـلم- لە مەککەوە دەرچوو بەرەو مەدینە بۆ بڵاوکردنەوەی تەوحید لەنێو خەڵکی پاشان گەڕایەوە بۆ مەککە بۆ فەتح ورزگارکردنی پێش ئەوەی وەفات بکات بەچەند ساڵێکی کەم.

وهیندۆسـیەت چەند سـیفەتێکی تری زیادکردووە بۆ ئەم پێغەمبەرە کە ئێمە پێی ڕازی نین، وەکو ئەوەی کالکی لای ئەوان بەرجەستەکردنی خوایە -هەروەکو خوویان وایە لەم بابەتەدا- خوای گەورە بەرز وبڵندە لەم وەسفکردنە -سبحانه وتعالى-، وپێشـتر وەڵامی ئەم بوختان ودرۆ هەڵواسینەمان دایەوە لە کتێبی ڤیداوە.

خوای گەورە بەرجەســتە وتێکەڵ نابێت لەگەڵ خوڵقێنراوەکانی وئاســمان وزەوییەکانی شوێنی ئەویان تێدا نابێتەوە وناتوانن دەوری بدەن.

بەڵام لەو ســیفەتانەی جێی ســەرنج بوو لەلام ئەوەیە ئەم پێغەمبەرە کە لە داهاتوو دێت سـواری ئەسـپێکی سـپی دەبێت، وپێغەمبەر -صـلى الله عليه وسـلم- ئەسـپێکی سپی هەبوو بەناوی (مرتجز).[٦٨]

---

[٦٧] كالكي بران، أدهياي:٢، شلوك:١١.

[٦٨] رواه الحاكم في المستدرك : صحيح الإسناد.

وئەو پەیکەرانەی هیندۆسیەکان دروستیان کردووە بۆ ئەم پێغەمبەرە کە دێت (کالکی) بەم شێوەیە : سواری ئەسپێکی سپی بـــووە وشمشێر لەسەر شانیەتی، وهەموو وێنە وپەیکەرە هیندۆسیەکان بەم شێوەیە وێنەی کالکی پیشان دەدەن.

ئەو پێغەمبەرێکی موجاهید وتێکۆشـــەرە، وئەمە ســـیفەتی پێغەمبەر موحەمەد کوڕی عبدالله یە -صلی الله علیه وسلم- ئەو جیهادی کرد وتێکۆشا بە شمشێر وجەنگی بەرپا کرد دژی دوژمنانی الله.

وهەروەها لە ســـیفەتەکانی پێغەمبەری داهاتوو کالکی لە کتێبەکانیاندا : (هەواڵ دەدات ســـەبارەت بە غەیب -ڕووداوی نەبینراوی داهاتوو-، ورەچەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ سەر بنەماڵە گەورەکانی قەومەکەی، وکەم قسە دەکات وسەخی وبەخشندەیە ولاشەی بەهێزە وزۆر سوپاسگوزارە).

هەروەها لە سیفەتە تایبەتیەکانی ئـەوەیە: (کالکی شەیتان لەناودەبات بەیارمەتی چوار لە هاوەڵانی).[٦٩]

ئەوەی دێت بە بیری هەموو مسـولْمانـــێک لەپاش خوێندنەوەی ئەم دەقە تەنها ئەم چوار هاوەڵەیە: ئەبوبەکری ســـدیق، عومەری کوڕی خەتاب، عوســـمانی کوڕی عەفان، عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب.

ئەوانە نزیکترین هاوەڵن لە پێغەمبەر -صـلی الله علیه وسـلم-، ئەوان پشـتیوانی بوون لەسەرەتای بانگەوازەکەیدا وبوون بە خەلیفە لەپاش ئەو.

پێغەمبەر -صـلی الله علیه وسـلم- چوار هاوەڵی زۆر تایبەتی هەبوو لەنێو ســەحابەدا زۆر نزیک بوون لێوەی و بەکردەوە پشتیوانیان لەبانگەوازەکەی دەکرد.

ئەوان بوون بە پێشەوای خیلافەتی مسوڵمانان لەپاش وەفات کردنی بەرِیزبەندی:

١- ئەبوبەکری سدیق.

٢- عومەری کوڕی خەتاب.

٣- عوسمانی کوڕی عەفان.

[٦٩] كالكي بران، أدهياي:٢، شلوك:٥.

٤- عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب.

وبە کوژرانی عەلی کوڕی ئەبی تـاڵـب -ڕەزای خوای لێبێـت- ، ســەردەمی خیلافەتی راشیدین کۆتایی پێهات.

لە سیفەتەکانی کالکی ئەوەیە کە فریشتەکان لەئاسمانەوە دادەبەزن بۆ یارمەتیدانی لە جەنگانیدا.[٧٠]

ئەمە سـیمایەکە لە سـیماکانی جیهادی ئیسـلامی لەسـەردەمی پێغەمبەر -صـلی اللە علیە وســلم-، چونکە فریشـــتەکان لە ئاســمانەوە دابەزین لە جەنگەکانی پێغەمبەر -صلی اللە علیە وسلم-، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿إِذْ تَسْــتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْــتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ﴾ واتە: ﴿یادی ئەوکاتە بکەنەوە کەلە پەروەردگارتان دەپاڕانەوە و داوای یارمەتیتان لێ دەکرد، خوایش خێرا هات بە هاناتانەوە و فەرمووی بەڕاستی من بەهەزار فریشتەی تر یارمەتی و کۆمەکیتان دەکەم بەشوێن ئەوانی تردا﴾[سورة الأنفال: ٩].

کالکی لە کتێبە هیندۆسیەکاندا دەڕوات بۆ شاخێک بۆئەوەی لە فریشـتەیەکی مەزنەوە فێر بێت بەناوی (براش رام) پاشـان دەڕوات بـــــەرەو باکوور دوای ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ گوندەکەی پێش ئەوەی بەرز بکرێتەوە بەرەو ئاسمان.[٧١]

(براش رام) لای هیندۆســیەکان: فریشـــتەیەکی مەزنە کە ســزا دەهێنێت بۆ ســەر کافرەکان، وئەویش لەلای مسوڵمانان جبريلە.

پێغەمبەر -صـلی اللە علیە وسـلم- ڕۆیشــت بۆ شـاخی حیرا وجبريل -علیە السـلام- دابەزی وهات بۆ لای، پاشـان پێغەمبەر -صـلی اللە علیە وسـلم- ڕۆیشـت بەرەو باکوور وکۆچی کرد بۆ مەدینە، پاشان گەڕایەوە ومەککەی فەتح ورزگار کرد پێش ئەوەی وەفات بکات بەچەندساڵێکی کەم.

وکالکي لەکتێبی هیندۆسیەکاندا کۆتا پێغەمبەرە.[٧٢]

---

[٧٠] كالكي بران، أدهياي:٢، شلوك:٧.

[٧١] كالكي بران، أدهياي ٣، شلوك ١-٥.

[٧٢] بهاغوت بران، اسكند:١، أدهياي:٣، شلوك: ٢٥.

زانراوە کە پێغەمبەر موحەمەد -صلى الله عليه وسلم- کۆتا پێغەمبەرە ؛

﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا﴾ واتە: ﴿موحەمەد (ﷺ) باوکی هیچ یەك لەپیاوەکانتان نییە (نەزەیدی کوڕی حاریثە و نەهیچ کەسێکی تر) بەڵکو ئەو نێرداروی خوا و کۆتاهەمینی پێغەمبەرانە وە خوا بەهەموو شتێك زانایە﴾[سورەتی الأحزاب : ٤٠].

وسیفەتی پێغەمبەری داهاتوو باسکراوە لە کتێبە هیندۆسیەکاندا ئەویش ئەوەیە: زۆر حەمد وسوپاسی خوای گەورە دەکات .. نراشنس.

نراشنس واتا: زۆر حەمد وسوپاس دەکات.

واتا: موحەمەد یان ئەحمەد.

هەردوویان ناوی پێغەمبەری خودان -صلى الله عليه وسلم- : موحەمەد وئەحمەد.

ولە سیفەتەکانی نراشنس ئەوەیە: (سواریەکەی وشترە، ودوانزە خێزانی هەیە، وبە سواریەکەی دەچێت بەرەو ئاسمان وپاشان دەگەڕێتەوە).[٧٣]

ئەم سیفەتانە تەنها لە پێغەمبەر موحەمەددا هەیە -صلى الله عليه وسلم- ولە هیچ کەسێکی تردا نیە.

سەبارەت بە سواریەکەی کە وشترە زانراوە کە پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- زۆر جار سواری وشتر بووە، وئەمیش ئاماژەیەکی گرنگە لە کتێبە هیندۆسیەکانەوە لەسەر ئەوەی هەرچەندە کۆتا پێغەمبەرە، بەڵکو لەکاتێکیش دەنێردرێت کە ئۆتۆمبێل وفڕۆکە بوونی نیە.[٧٤]

ئاماژەیەکی تری تێدایە ئەویش ئەوەیە ئەم پێغەمبەرە کە لە داهاتوودا دێت لە دەرەوەی هیندۆسیە براهمەکانە چونکە ئەوانە سواربوونی وشتر بە حەرام دادەنێن.

وسەبارەت بەوەی دوانزە هاوسەری هەیە ئەمیش زانراوە لە سیرەی پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم-.

---

[٧٣] أتهر ويد، كاند:٢٠، سوكت:١٢٧، منترا:٢.

[٧٤] دعوة الهندوس إلى الإسلام، پەیامی دکتۆرا لەئامادەکردنی: د. إبراهيم عبد الغفور، ل ٢١٥.

وسـەبارەت بەوەی بەرز دەبێتەوە بەرەو ئاسـمان بە سـواریەکەی پاشـان دادەبەزێت، وجۆری سـواریەکە لێرەدا دیاری نەکراوە، ئەمە باسـی ئیسـرا ومیعراجە -شـەورەوی وبەرزبوونەوەیە بەرەو ئاسـمان ودابەزین- کە هەموو مسـوڵمانێک باوەڕی پێی هەیە، کاتێک پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- بەرەو ئاسمان بەرز کرایەوە.

هەروەها کتێبە هیندۆسـیەکان لە هەمان بـەش باسـی کۆچی نراشـنس دەکەن وسـتایشـی دەکەن ودەڵێت: (ئەی خەڵکینە ڕێز بگرن لە نراشـنس، من ئەو کۆچکارە دەپارێزم، کە ئاسایش دەهێنێت).[٧٥]

ئەو کۆچکارە: ولە گەورەترین ڕووداوەکان لە سیرەی پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- کۆچکردنی -هیجرەی- بوو لە مەککەوە بۆ مەدینـە بۆئەوەی تەوحید وئاسایش لەنێو خەڵکیدا بڵاو بکاتەوە.

لە مانترای داهاتوو باسی جیهادی پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- دەکات ودەڵێت: (تەسبیحات دەکات لەگەڵ ئەوانەی تەسبیحـات دەکەن ودەردەچێت بۆ جەنگەکان وئاسایش بۆ خەڵکی دەهێنێت).[٧٦]

ئەو پێغەمبەرێکی تێکۆشەر وموجاهیدە ئەمن وئاسایش لەنێو خەڵکیدا بڵاو دەکاتەوە بە جیهادکردنی لە پێناو الله.

دەیەها دەق هەیە لەکتێبەکانیادا کە باسی هاتنی ئیسلام وپێغەمبەرەکەی وسیرەی -ژیاننامەی - وبانگەوازیەکەی ومەککەی پیرۆز دەکات.

ڕەنگە هەندێک لە هیندۆسـەکان لەگەڵ هەندێک لەم دەقانە ناکۆک بن، وڕەنگە ڕەتی بکەنەوە کە بە ڕوونی ئاماژەیان تێدایە بۆ پێغەمبەر موحەمەد -صلى الله عليه وسلم-، بەڵام ئەم شـتانە نابێت زۆر هیندۆسـیەک سـەرقاڵ بکات کە بەدوای ڕاسـتییەکاندا دەگەڕێت، چونکە ئەم موژدانە تەنها لەڕوانگەی پشـتڕاسـتکردنەوەن هیچی تر نا، بۆیە زۆر بەدرێژی باسی موژدەکانم نەکرد ئەگەرچیش زۆر وهەمەچەشنن، چونکە گەورەترین بەڵگە لەسەر ڕاستێتی ئیسلام بریتیە لە پەیامی ئیسلام لە خودی خۆیدا وبانگەوازی بۆ تەوحید -یەک خوا پەرستی- وبانگەوازی فیترەتی تێدایە وهەموو ئاینەکانی سەر زەوی

---

[٧٥] أتهر ويد، كاند:٢٠، سوكت:١٢٧، منترا:١.

[٧٦] أتهر ويد، كاند:٢٠، سوكت:١٢٧، منترا:٥ وما بعدها.

جگە لە ئیســـلام ناتوانن بەکاملّی پێویســـتیەکانی مرۆڤ بهێننە دی بۆئەوەی بزانرێت مەبەست لەبوونی مرۆڤ وچارەنووسی چـیە (تەنها ئیسلام وەڵامی هەموو پرسیارەکانی تێدایە سەبارەت بە بوونی مرۆڤ وچۆنیەتی کردەوە کردنی لەم ژیانە وچارەنووسی).

لەسەر زەوی تەنها چەند ئاینێکی شێواو وبت پەرستی وئیلحاد -بێ دینی- هەیە، وتەنها ئاینی ئیسلام لەسەر تەوحیدی پاك و بەپاك وپیرۆزدانانی الله ماوەتەوە.

﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ * (ئەی پێغەمبەر ﷺ) بڵێ: هەر ئەو (الله) یە خوای تاك وتەنها (١) اللَّهُ الصَّـمَدُ * ئەو خوایەی بێ نیازە وجێی نیاز وئومێدی (باوەڕدارانە) (٢) لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ * کەســی لێ نەبووە ولەکەس نەبووە (٣) وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ * وە هەرگیز هیچ کەس هاوشێوە وهاوتای ئەو نیە (٤)﴾[سورەتی الإخلاص].

## ١٨- ئیسلام چییە؟

و: ئیسلام واتە تەسلیم بوون و ملکەچی وگوێڕایەڵی بۆ خوای گەورە.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّـــهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَاتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَاتَّخَذَ اللَّـهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلًا﴾ واتە: ﴿کێ هەیە ئاینی چاکترو پەسەندترو جوانتر بێت لەو کەسەی ڕووی کردۆتـە خوا و خۆی تـەســـلیمی ئـەوزاتـە کردووە و لـەکـاتێکـدا کـارجوان و کـار پەسەندەو شوێنی ئاینی ئیبراهیمی ملکەچ و فەرمانبەردار کەوتبێت، کە خوا ئیبراهیمی کردۆتە خۆشەویستی خۆی ڕێزداری کردووە.﴾[سورەتی النساء: ١٢٥]

مانای ﴿أَسْـلَمَ وَجْهَهُ لِلَّـــهِ: ڕووی کردۆتە خوا و خۆی تەسـلیمی ئەوزاتە کردووە﴾ واتە: تەسلیم و ملکەچ بوو بۆ خوای گەورە وپیرۆز، وگوێڕایەڵی بووە، ئەمە باشترین کەسە لە ڕوانگەی دینداریەوە.

وخوای گەورە دەفەرموێت:

﴿فَإِلَـــهُكُمْ إِلَـــهٌ وَاحِدٌ فَلَهُ أَسْلِمُوا وَبَشِّرِ الْمُخْبِتِينَ﴾ واتە: ﴿خوای ئێوە خوایەکی تاك و تـەنهایە، هـەمووتان تـەســـلیم و ملکەچی ئەو بن، مژدەش بـدە بـەبـەنـدە ملکەچ و فەرمانبەردارو دڵ ئاوەدانەکان﴾[سورة الحج: ٣٤].

مانای ﴿فَإِلَـهُكُمْ إِلَـهٌ وَاحِدٌ فَلَهُ أَسْلِمُوا وَبَشِّرِ الْمُخْبِتِينَ:هەمووتان تەسلیم و ملکەچی ئەو بن﴾ ؛ واتا: ملکەچ و تەسلیمی حوکمەکەی بن.

مانای ئەم ئایەتانە ئەوە دەخاتە ڕوو کە ئـــیسـلام واتە تەسـلیم بوونی ڕەها بۆ خوای گەورە و ملکەچبوون بۆ ئەو زاتە شکۆدارە و گوێڕایەڵیکردنی شەریعەت و مەنهەجەکەی بە ڕازی بوون و قبوڵ کردن ئەمە ناوەڕۆک و هەقیقەتی ئیسلامە.

ئیسلام واتە ملکەچبوون بۆ خوای گەورە لە قەزا و قەدەر و شەریعەتەکەی.

ئیسلام ئایینی خوای گەورەیە بۆ هەموو مرۆڤایەتی، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ ...﴾ واتە: ﴿ئایینی ڕاست لای خوای گەورە ئیسلامە...﴾[سورەتی آل عمران: ١٩].

ئیسـلام ئەو ئاینەیە کە خوای گەورە هیچ ئاینـــێکی تر قبوڵ ناکات جگە لە ئەم ئاینە، ﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْـــلَامِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِــرِينَ﴾ واتە: ﴿و هەرکەســێک ئاینێکی تر پەیڕەو بکات جگە لە ئیســلام هەرگیز لێی قبوڵ ناکرێت لە قیامەتیشدا لە دۆڕاوەکان دەبێت﴾[سورەتی آل عمران : ٨٥].

ئیسلام ئەو ئاینەیە کە خوای گەورە هەموو پێغەمبەرانی پێ ناردووە، ئاینی پێغەمبەران یەکە ئەویش ئیســلامە، هەموو پێغەمبەران تەوحید -یەک خوا پەرســتی- یان هێناوە ئەگەر چیش شەریعەتەکانیان جیاواز بن.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَـــهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾ واتە: ﴿ئێمە پێش تۆ هیچ پێغەمبــەرێکمان ڕەوانە نەکردووە، کە وەحیمان بۆ نەناردبێت بەوەی کە: بێگومان هیچ خوایەک -پەرســتراوێک نیە بەهەق وڕاســتی- نیە جگە لە من و دەبێت هەر من بپەرستن﴾[سورة الأنبياء: ٢٥].

تەنها ئاینی ئیسلام لەسەر ئەم تەوحیدە ماوەتەوە.

ئیسلام تاکە ئاینی تەوحیدیە لەسەر زەوی.

لەکاتێکدا ئەوانەی خۆیان داوەتە پاڵ شــەریعەتەکانی تر شــیرک وهاوبەش بڕیاردانیان تێدا ماوە، کەم یان زۆر بێت، پاش مردنی پێغــەمبەران وپاش ئەوەی خەڵکی وازیان لە

تەوحید هێنا خەڵکی لەگەڵ کاتدا تووشـی شـیرک وهــــاوبەش بڕیاردان بوون بۆ الله، وئەمڕۆ تەنها ئاینی ئیســلام لەســەر ئەو تەوحیدە پاکە ماوەتەوە کە پێغەمبەران پێی هاتوون.

بۆیە گەورەترین بەڵگە لەسەر ڕاستی ئیسلام کە پێویستە هیندۆسی شوێنی بکەوێت بریتیە لە پەیامی ئەم ئاینە تەوحیدیە پاکە.

## ١٩- ئایا ئیســلام دەتوانێت وەڵامی ئەو پرســیارانە بداتەوە کە ئەقڵەکان نەیانتوانیوە وەڵامیان بدەنەوە، وەک :ئێمە لە کوێوە هـاتووین؟ بۆچی ئێمە لێرەین لەم دونیـایە؟ ســەرەنجام وچارەنووسمان بەرەو کوێیە؟

و: ئیســلام وەڵامی هەموو ئەم پرســیارانەی داوەتەوە لە یەک ئایەتی قورئانی پیرۆزدا، خوای گەورە -سبحانه وتعالى- دەفەرموێت:

﴿وَمَا لِيَ لَا أَعْبُدُ الَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ واتە: ﴿جا ئـەوە بۆچی من ئـەو زاتـە نەپەرستم کە بەدی هـێناوم، ئێوەش خەڵکینە هەر بۆ لای ئەو دەبرێنەوە.﴾[سورة يس: ٢٢].

لەکوێوە هاتم؟ خوای گەورە منی دروست کردووە.

وبۆ کوێ دەچم؟ دەگەڕێمەوە بۆ لای خوای گەورە بۆئەوەی لێپرسینەوەم لێبکات لەسەر کردەوەکانم ﴿وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ : ئێوەش خەڵکینە هەر بۆ لای ئەو دەبرێنەوە﴾.

بۆچی هاتووم بۆ ئەم جیهانە؟ بۆئەوەی الله بپەرستم وتاقی بکرێمەوە.

بۆچی الله بپەرســتم؟ ئەمە ســروشــتیە کە الله بپەرســتم کە منی خوڵقاندووە، ئەمە ســروشــتی پەیوەندیە لەنێوان بەندە وپەروەردگاری ئەویش ئەوەیە: بەندە پەروەردگار وخوڵقێنەری بپەرستێت ؛ ﴿وَمَا لِيَ لَا أَعْبُدُ الّــذِي فَطَرَنِي﴾ واتە: ﴿جا ئەوە بۆچی من ئەو زاتە نەپەرستم کە بەدی هێناوم﴾.

یەک ئایەت وەڵامی سێ لە گرنگترین پرسیارەکانی بوونی تێدایە کە مرۆڤەکانی تووشی شڵەژاوی کردووە،

﴿وَمَا لِيَ لَا أَعْبُدُ الَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ واتە: ﴿جا ئەوە بۆچی من ئەو زاتە نەپەرستم کە بەدی هێناوم، ئێوەش خەڵکینە هەر بۆ لای ئەو دەبرێنەوە.﴾[سورة يس: ٢٢].

## ٢٠- چۆن زانیت کە موحەمەد -صلى الله عليه وسلم- پێغەمبەرە لەلایەن خوداوە نێردراوە؟

و: بەڵگە زۆرە موعیجزەکان ئاماژەن بۆ زنجیرەی -مەنتیقی- واتایی ودڵنیایی تەواو سەبارەت بەپێغەمبەرایەتی.

ئەرستۆ فەیلەسوفە بەکۆی کارەکانی نەک بەهۆی ڕستەیەک کە وتوویەتی یان لێکدانەوەیەکی فەلسەفی.

ئەبوقرات بەکۆی پرۆژەکانی پزیشکە نەک بەهۆی نەشتەرگەریەک کە کردوویەتی.

هەروەها بەڵگە موعجیزە باسکراوەکان لە پێغەمبەرەوە -صلى الله عليه وسلم- ئاماژەن بۆ زنجیرەی -مەنتیقی- واتایی ودڵنیایی تەواو سەبارەت بەوەی کە پێغەمبەرە.

ئەگەر سەیری ژیاننامەی بکەیت -صلى الله عليه وسلم- دەبینیت ڕاستگۆ بوو و بە ڕاستگۆیی ناوبانگی دەرکردووە تەنانەت لەلایەن دوژمنە سەرسەختەکانیشیەوە، وهەرگیز تۆمەتی درۆ وتاوانی بۆ هەڵنەبەستراوە، پاشان ئەو باسی شتە نەبینراوەکان -غەیب- دەکات وبەو شێوەیە ڕوودەدات کە ئەو باسی کردووە، وپێش ئەمانە هەر لە یەکەم ڕۆژەوە بیروباوەڕی وەکو بیروباوەڕی هەموو پێغەمبەرانە کە بانگەشەیان بۆ کردووە، پاشان پێغەمبەرانی پێش خۆی موژدەی هاتنی ئەمیان داوە سەدەها ساڵ پێش ئەوەی ببێتە پێغەمبەر، ئەمانە هەمووی ئاماژەن بۆ زنجیرەی -مەنتیقی- واتایی ودڵنیایی تەواو سەبارەت بە دروستێتی پەیامەکەی.

پاشان چی دەڵێی سەبارەت بە گەورەترین نیشانە وئایەت کە پێی هاتووە ئەویش قورئانی پیرۆزە؟

خوای گەورە بە قورئان تەحەدای ڕەوانبێژ وقسەزانەکانی کردووە کە ئەگەر دەتوانن شتێک بهێنن وەکو قورئان یان تەنانەت سورەتێک وەکو سورەتەکانی، بەڵام نەیانتوانی.

﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّثْلِهِ وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللَّـهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ واتە: ﴿بەڵکو (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا) ئەوانە دەڵێن کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قورئانی هەڵبەستووە، بڵێ: دە ئێوەش سوورەتێک وەک سوورەتەکانی دارێژن و بیهێنن، داوا بکەن لەهەر کەسێکی تر کە دەتوانن جگە لەخوا (کەیارمەتیتان بدات) درێغی مەکەن ئەگەر ڕاستگۆن﴾ [سورة يونس: ٣٨].

وخوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّـهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ * جا ئەگەر ئێوە لە دوو دڵیدان و گومانتان لەم (قورئانە پیرۆزە) هەیە کە دامانبەزاندووە بۆ بەندەی خۆمان موحەمەد (صلى الله عليه وسلم) ئەگەر بۆتان دەکرێت ئێوەش هەوڵ بدەن سوورەتێکی وەك ئەو بهێنن، هاوپەیمان و هاوکارەکانیشتان جگە لە خوا (بۆ ئەو مەبەستە) بانگ بکەن ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن (٢٣) فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا وَلَن تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ * خۆ ئەگەر نەتانتوانی و هەرگیز نایشتوانن (کەواتە باوەڕبهێنن و) خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی: سووتەمەنیەکەی خەڵکی و بەردە، کە بۆ بێ باوەڕ و خوانەناسان ئامادە کراوە (٢٤)﴾[سورة البقرة].

بڕوانە کاتێک پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا وَلَن تَفْعَلُوا * خۆ ئەگەر نەتانتوانی و هەرگیز نایشتوانن﴾[سورەتی البقرة: ٢٤].

نەیانکرد ونەیانتوانی.

قورئانی پیرۆز هێشتا بەبەردەوامی تەحەدای ڕەوانبێژ وقسەزانەکان دەکات لە موشریکەکان، بەڵام ئەوان هێشتا ناتوانن تەحەداکە قبوڵ بکەن ومەحاڵە پێیان بکرێت شتێک هاوشێوەی قورئان بهێنن.

د. عبـدالله دراز -ڕەحمەتی خوای لێبێـت- دەڵێت: (ئـایا پێغەمبەر -صـــلی الله علیه وسلم- بەم تەحەدایە نەترسا لەوەی ببێتە هۆی هەڵگیرساندنی گەرموگوڕ وحەماسەتی ئەدەبی؟

بۆیە هەموویـان هەڵـدەســـتـان بە کێبڕکێ کردنی بەئـاگـاداریەوە ؛ چی بکـات ئەگەر کۆمەڵێک لە ڕەوانبێژ وقسەزانەکانیان ڕێککەوتبان لەسەر ئەوەی قسەیەک بهێنن وەکو قورئان بێت ئەگەرچیش لەهەندێک لایەنیەوە بێت!

پاشان ئەگەر قەناعەتی بە خۆی کردبێت کە ئەم حوکمە بدات بەسەر خەڵکی سەردەمی خۆی ؛ ئەی چۆن حوکم دەدات بەسەر نەوەکانی داهاتوو؟

بەڕاســـتی ئەم شـــتە پیاوێک ناوێرێت بیکات کە نرخی خۆی بزانێت مەگەر ئەوە نەبێت بەتەواوی متمانەی هەیە بە هەواڵی ئاسـمانی و بەو ڕێگایەی بڕیاری ئاسـمانی بابەتەکە بەڕێوە دەبات، بەم شێوەیە تەحەداکەی خستە پێش جیهان، بۆیە بڕیارێکی یەکلاییانە بوو، هەرکەســـێک پێچەوانەی بێتەوە ئەوا تووشـــی لاوازی وبێ تواناییەکی ئاشـــکرا، وشکستی ڕوون بووە بەدرێژی سەردەم وکاتەکان).[٧٧]

ئەو موشـریکانە پێیان وابوو کۆکرنەوەی سـوپاکان وگردبوونەوەی کۆمەڵەکان بۆ جەنگان دژی پێغەمبەری خودا -صـلی الله علیە وسـلم- ئاسـانترە لە لاسـایی کردنەوەی قورئان وقبوڵکردنی تەحەدیەکە؛ چونکە ئەمە ئەوپەڕی هەوڵدانیانی دەویـست،

﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَسْمَعُوا لِهَـٰذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ﴾ واتە: ﴿بێ باوەڕان دەیانوت: گوێ مەگرن بۆ ئەم قورئانە و بیکەن بەگاڵە و هەرا و هوریا بۆ ئـــــەوەی ئێوە زاڵ ببن و بیبەنەوە﴾[سورة فصلت: ٢٦].

هەموو عەرەب وئەو ئومەتانەیشـی ئەم تەحەدایەیان پێگەیشـتووە ؛ نەیانتوانی شـتێک بکەن کە مولحیدەکان وئەوانی تر لە بێباوەڕان بتوانن پێی بحەوێنەوە ودڵی کەســـانی تری پێ خۆش بکەن.

ئالوســـی -ڕەحمەتی خوای لێبێت- دەڵێت: (هیچ یەکێکیان هەتاوەکو ئەمڕۆیش هیچ وشـەیەکی نەووت وباسـی هیچ وەسـف و وەسـفکراوێکی نەکرد) ؛ مەبەسـتی ئەوەیە

[٧٧] النبأ العظيم، د. عبد الله دراز-ڕەحمەتی خوای لێبێت- ، ل ٤٤-٤٥.

نەیانتوانی بەهیچ شـێوەیەک ڕەد و وەڵامی قورئان بدەنەوە ونەیانتوانی سـورەتێکیش هاوشێوەی قورئان بهێنن.

لە جوبەیری کوڕی موتعیمەوە -ڕەزای خوای لێبێت- (کاتێک هێشـتا مسـوڵمان نەبوو) دەڵێت: «گوێم لە پێغەمبەری خودا بوو -صـلی الله علیه وسـلم- لە نوێژی مەغریبدا -سورەتی الطور-ی دەخوێند، کاتێک گەیشت بە ئەم ئایەتە:

﴿أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَـيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ * ئایا ئەوان (بێ خوڵقێنەرێک) لە خۆیانەوە دروست بـوون یان خۆیان (خوڵقێنەر) ودروستکاری خۆیانن؟(٣٥) أَمْ خَلَقُوا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بَل لَّا يُوقِنُونَ * ئەی ئایا ئەوان ئاسمانەکان وزەوییان دروست کردووە (نەخێر وا نیە) بەڵکو دڵنیا نین ولەگێژاوی گوماندا دەژین(٣٦) أَمْ عِندَهُمْ خَزَائِنُ رَبِّكَ أَمْ هُـمُ الْمُصَـيْطِرُونَ * ئەی ئایا گەنجینەکانی پەروەردگاری تۆ لای ئەوانە؟ یان ئایا هەر ئەوان دەسەڵاتدار وزاڵن (٣٧)﴾[سورة الطور]، دەڵێت: دڵم خەریک بوو بفڕێت».[٧٨]

قورئان نهێنی سەیر وعەجیبی تێدایە کە دەگاتە نەفسی مرۆڤ.

تێڕامان بکە چۆن ئافرەتانی موشـریکەکان کۆدەبوونەوە لە دەوری ماڵی ئەبوبەکر کاتێک قورئانی دەخوێند چونکە زۆر سـەرنجی ڕادەکێشـان وکاریگەربوون پێی، ئەمەش بووە هۆی نارەحەتی لای پیاوانی قوڕەیش.[٧٩]

وبۆیە شـاندەکانی عەرەب ڕێککەوتن لەسـەر ئەوەی گوێ لە قورئان نەگرن ورێگا نەدەن کەس گوێی بۆ بگرێت لە کەسوکاریان، ئەمە تاکە ڕێگایە بۆ مانەوە لەسەر کوفر.

لە سـەرسـوڕهێنەرەکانی قورئانی پیرۆز کە نەبڕاوەن ویەکێک لەوانەی د. عبدالله دراز -ڕەحمەتی خوای لێبێت- باسـی کردووە لە مەسـەلەی دابەزینی ئایەتەکانی قورئان لە ماوەی جیاوازدا، پاشـان پێغەمبەر -صـلی الله علیه وسـلم- ئاماژەی کرد بۆ دانـانی ئایەتەکان لە شوێنی دیاریکراو لە نێوان سورەتەکان وئایەتی تر لە نێو سورەتی تر، پاشان هەر سـورەتێک وەکو پێکهاتەیەکی سـەربەخۆ دەردەکەوێت، -ڕەحمەتی خوای لێبێت- دەڵێت: (لەکاتی دابەزینی قورئان هەندێک بابەت لەقورئاندا جیاواز بوون لە ئەوانی تر، بۆیە پلەبەپلە دەبوونە یەکەیەکی سـەربەخۆ پاش ئەوەی ئایەتی تر دادەبەزی -لەسـەر

[٧٨] صحيح البخاري : ٤٨٥٤.

[٧٩] صحيح البخاري : ٣٩٠٥.

هەمان بابەت-، هەندێکیان لێرە وئەوانی تر لەشوێنی تر لـــەگەڵ ئەوانی تر دادەنران، بەپێی فەرمانی پێغەمبەر -صـــلی الله علیه وســـلم- کە ئەویش لە ڕۆحی پیرۆزەوە -جبریلەوە- پێی دەگەیشت.

ئەگەر ســـەیری مێژووی دابەزینی ئابەتەکانی قورئانی پیرۆز بکەین، تێبینی دەکەین ئەم وەحیە بەشـێوەیەکی گشـتی بەسـترابووەوە بە حاڵەت وبۆنە ورووداوی تایبەت، وئەمە وامان لێدەکات پرسـیار بکەین سـەبارەت بە ئەو کاتەی کە ڕێکخسـتنی هەر سـورەتێکی تێدا تەواو بوو وەکو یەکەیەکی سەربەخۆ.

وەکو ئەوە وابێت قورئان پارچەپارچەی جیاواز وژمارەدار بێت لەســـەر بینایەکی کۆن، ودووبارە بنیات نرایەوە لە شـوێنێکی تر لەسـەر هەمان شـێوازی پێشـوو، ئەگەر نا چۆن دەکرێت لێکدانەوە بکرێت بۆ ئەم ڕێکخستنە خـێرا ومەنهەجیانەی زۆرێک لەسورەتەکان لەهەمان کاتدا؟

بەڵام چی زامنێکی مێژووی مرۆڤ دەتوانێت بەدەستی بهێنێت لەکاتی دانانی ئەم پیلانە سەبارەت بە ڕووداوەکانی داهاتوو وداواکراوەکانی شەریعەت، وچارەسەرە ویستراوەکان، چ جای شێوازی زمانەوانی کە دەبێت ئەم چارەسەرانەی تێدا پیشان بدرێـت، وهەروەها گونجاوی شێوازی لەگەڵ ئەم سورەتە جیا لە ئەوانی تر؟

ئـــــایا ناگەینە سـەرەنجامی ئەوەی ئەم پیلانە وجێبەجێبوونی بەو شـێوەیەی هیوامان دەخواست، دەبێت لەلایەن خوڵقێنەرێکی مەزنەوە پیلانی بۆ دانرا بێت، کە توانای هەیە ئەم گونجاندنە داواکراوە دامەزراو بکات؟).[80]

قورئان موعجیزەیەکی سـەربەخۆیە لەسـەر ڕاسـتگۆیی پەیامبەرایەتی -صـلی الله علیه وسلم-.

وئەو موعجیزانەی لەسـەر دەسـتی ڕوویداوە -صـلی الله علیه وسـلم- زۆرن وزیاترن لە هەزار، وڕوودانـی مـاوەکەی دوور نـیە وئەوانەی گـێـڕاویـانەتەوە لە ڕاســـتـگۆتـریـن وچاکەکارترین خوڵقێنراون.

ئەو گێڕەرەوانە کە ئەم موعجیزانەیان بۆ ئێمە باسـکردووە لە شـتی زۆر ورددا درۆ ناکەن ئەی چۆن درۆ بەناوی ئەوەوە دەکەن، لەکاتێکدا دەزانن ئەوەی درۆ بەناوی ئەوەوە بکات

[80] کتاب مدخل إلی القرآن الکریم، د. عبد الله دراز.

ئەوا با شوێنێک بۆ خۆی دابنێت لە دۆزەخ، هەروەکو پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- هەڕەشەی کردووە.

هەندێک لە موعجیزەکانی هەزارەها لە هـــــاوەڵان بینیوویانە لەوانەی لە دەوروپشـتی بوون -صـــلى الله عليه وســـلم-، وهەندێکیان دەیەها لە هاوەڵان گێڕاویانەتەوە چۆن دەکرێت هەموویان کۆک بن لەسەر درۆکردن لەم هەموو گێڕانەوەیە؟

نمونە لەســـەر موعجیزەکانی کە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی بینیان: فەرموودەی گریان ونـاڵەی قەدی دارەکە ئەمـیش فەرمـوودەیەکـی بەنـاوبـانـگە ومـتەواتـیـرە -زۆرێـک گێڕاویانەتەوە- ؛ پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- وتاری دەدا لەسەر ئەو قەدی دارە، کاتێک مینبەرێکی بۆ دروستکرا و بەسەریدا سەرکەوت و وتاری دا، قەدی دارەکە دەستی کرد بە گریان وناڵە وەکو گریان وناڵەی منـــــداڵ، بەردەوام بوو لەسـەر ئەمە هەتاوەکو پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- باوەشی پێدا کرد وبێدەنگ بوویەوە.

ئەم فەرموودەیە ئەم هاوەڵانە گێڕاویـــانەتەوە: (أنس بن مالك، وجـــابر بن عبد الله، وعبد الله بن عباس، وعبد الله بن عمر، وأُبي بن كعب، وأبي سـعيد، وسـهل بن سـعد، وعائشة بنت أبي بكر، وأم سلمة).

ئـایا ئەم ژمـارەیە لە هـاوەڵان ؛ دەکرێت یەکـدەنـگ بن لە درۆکردن لە گێڕانەوەیەکی هەواڵی وەکو ئەمە؟

بەڵکو هەندێک لە موعجیزەکانی هـــەزارەها لە هاوەڵان ئامادەی بوون وەکو دەرچوونی کـانیـاوی ئـاو لەنێو پەنجە پیـــــــرۆزەکـانیەوە هەتـاوەکو هەزار وپێنج ســـەد هـاوەڵ دەستنوێژیان لێگرت ولێیان خواردەوە، وفەرموودەکە متەواتیرە ولە گێڕانەوەی (بخاري) و (مسلم)ە.

زۆربوونی خـواردنـێـکی کەم بۆئەوەی ســـوپـایەکـی مەزن لـێـی بخـوات، وئەمـیش گێڕانەوەیەکی متەواتیرە لە هاوەڵانەوە، وئیمامی بوخاری بەتەنها موعجیزەی زۆربوونی خواردن لەســەر دەسـتی پێغەمبەر -صـلى الله عليه وســلم- لە زیاتر لە پێنج شــوێن باسکردووە لە سەحیحەکەیدا.[81]

---

[81] البخاري (١٢١٧)، البخاري (٢٦١٨)، البخاري (٣٥٧٨)، البخاري (٤١٠١)، البخاري (٦٤٥٢). وهەموویان ڕووداوی جیاواز بوون وئەمانە تەنها لە بوخاریدا هاتوون !

ئەگەر بەڵگەکانی ڕاســـتگۆیی دامەزراو بن وموعجیزەکان زۆر بن لەســـەر ڕاســـتگۆیی پێغەمبەرایەتی -صـــلی الله علیه وســـلم-، ئیتر چۆن ئـاقڵێـک هەموو ئەمانە بەدرۆ دەخاتەوە؟

وئەمیش هەندێک موعجیزەی ترە لە موعجیزەکانی پێغەمبەر -صلی الله علیه وسلم-:

پێغەمبەر -صلی الله علیه وسلم- شەوێکیان هەواڵیدا بەوەی بایەکی توند هەڵدەکات، ونەهی کرد لەخەڵکی بەپێوە بوەستن، پیاوێک هەستا وبایەکە هەڵیگرت ولە شوێنێکی دوور فڕێی دا.[٨٢]

وهەواڵیدا -صلی الله علیه وسلم- سەبارەت بە مردنی نەجاشی لەو ڕۆژەی تێیدا مرد، ونوێژی لەسەر کرد وچوار تەکبیرەی کرد.[٨٣]

پێغەمبەر -صـــلی الله علیه وســـلم- باســـی ئەوەی کرد کە عومەر وعوســـمان وعەلی وتەڵحە وزوبەیر شـــەهید دەبن -ڕەزای خوایان لێبێت-، وئەوان وەکو خەڵکی ئاســـایی لەسەر جێگاکانیان نامرن.

پێغەمبەری خودا -صـلی الله علیه وسـلم- لەگەڵ ئەبوبەکر وعومەر وعوسـمان وعەلی وتەڵحە وزوبەیر چووە سەر شاخێک، ئەو بەردەی لەسەری بوون جوڵایەوە، پێغەمبەری خودا -صلی الله علیه وسلم- بەشاخەکە فەرمووی: (ئارام بە، کەس لەسەرت نیە جگە لە پێغەمبەرێک یان ڕاستگۆیەک یان شەهیدێک نەبێت).[٨٤]

جەختی کردەوە لەســەر پێغەمبەرایەتی بۆ خۆی وڕاســتگۆیی بۆ ئەبوبەکر وبۆ ئەوانی تر شەهید بوون، وئەوەی باسیکرد ڕوویدا.

و ١٥٠ فەرموودە هەیە کە پێغەمبەر -صـــلی الله علیه وســـلم- لە پەروەردگاری پاڕایەوە ودەستبەجێ وەڵامی دراوەتەوە وخەڵکیش شاهێدی لەسەر ئەمە دەدەن ![٨٥]

---

[٨٢] صحيح مسلم: ٣٣١٩ .

[٨٣] صحيح البخاري : ١٣٣٣.

[٨٤] صحيح مسلم: ٢٤١٧.

[٨٥] ئەم فەرموودانە کۆکراوەتەوە لەلایەن : سعيد ين عبد القادر باشنفر، لەکتێبی (دلائل النبوة)، لەچاپی (دار ابن حزم)]

خەڵکی مەککە داوایان لە پێغەمبەری خودا -صـلی الله علیه وسـلم- کرد کە موعجیزە ونیشـــانەیەکیان پێ نیشـــان بدات، ئەویش نیشـــانی دان کە مانگ بوو بە دوو لەتەوە، وکێوی حیرا لەنێوانیان بوو، وئەم فەرموودەیە متەواتیرە واتا؛ لەئەوپەڕی بەرزی پلەی سەحیحی دایە.

پێغەمبەر -صلی الله علیه وسلم- سورەتی (القمر)ی دەخوێند کە موعجیزەی لەتبوونی مانگی تێدا باسکراوە لەکاتی کۆبوونەوە گەورەکان وەکو جومعەکان وجەژنەکان بۆئەوەی خەڵکی ئەو موعجیزەیە ببیســـتن وئەم موعجیزەیەی بەکاریدەهێنا وەکو بەڵگەیەک لەسەر ڕاستگۆیی پێغەمبەرایەتی.

پاشـان پێغەمبەر -صـلی الله علیه وسـلم- هەواڵیدا سـەبارەت بەوەی کە ئادەم کۆتا خوڵقێنراوی زیندووە، دەفەرموێت: (وئادەم دروســتکرا لەپاش عەســر لەڕۆژی جومعە؛ کۆتا خوڵقێنراو بوو).[٨٦]

وئەم هەقیقەتە ئێستا لەڕوانگەی زانستیەوە سەلێمنراوە، زانست سەلماندوویەتی کە مرۆڤ کۆتا بوونەوەرە کە دەرکەوتووە لەسـەر زەوی، کەواتە چۆن پێغەمبەر -صـلی الله علیه وسـلم- زانی کە ئادەم -علیه السـلام- کۆتا بوونەوەرە کە دەرکەوت لەسـەر زەوی لەپاش دەرکەوتنی ڕووەک وئاژەڵ؟

سەیری ئەم ئایەتە بکە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ آيَتَيْنِ فَمَحَوْنَا آيَةَ اللَّيْلِ وَجَعَلْنَا آيَةَ النَّهَارِ مُبْصِـــرَةً﴾ واتە: ﴿ئێمە دیاردەی شەو و ڕۆژمان کردووە بە دوو بەڵگە و نیشانە (لەسەر دەسەڵاتی خۆمان و بۆ حەســـانەوە و ئەنجامدانی کاروبارتان و ڕاگرتنی پلەی گەرمای لەبار بۆ ژیانتان)، ئینجا ئێمە تاریکیمان بەسەر دیاردەی شەودا هێناوە و دیاردەی ڕۆژیشمان بە ئاشکرا و دیار و بینراو سازاندووە﴾[سورەتی الإسراء: ١٢].

﴿فَمَحَوْنَا آيَةَ اللَّيْلِ * ئینجا ئێمە تاریکیمان بەسـەر دیاردەی شـەودا هێناوە﴾ : واتا مانگ کە دیاردەی شەوە ؛ ڕۆشنا بووە پاشان ڕۆشناییەکەی لابراوە.

ئەمە لێکدانەوەی هاوەڵانە بۆ ئەم ئایەتە پیرۆزە، ئیمام ئیبن کەســـیر -ابن الكثير- لە تەفســـیرەکەیدا دەیگێڕێتەوە لە عبداللە کوڕی عەباســـەوە -ڕەزای خوایان لێبێت- کە

[٨٦] صحيح الجامع : ٨١٨٨ .

دەڵێت: (مانگ ڕۆشــنا بوو هـــــەروەکو ڕۆشــنایی خۆر، بووە نیشــانەی شــەو، بۆیە ڕۆشناییەکەی لابرا).

ســەیر ئەوەیە کە زانســتی ئەمڕۆ پێی گەیشــتووە، ناسـا بڵاوی کردەوە لەســەر ماڵپەڕ وکەناڵە فەرمیەکانی: یەکەم ماوەی تەمەنی مانگ وتێیدا ڕۆشـنا ودرەوشـاوە بوو -وەکو خۆر-.[٨٧]

بە متەواتیر ســەلێمنراوە کە ئەو نیشــانە وئایەتە ڕوویداوە وهەروەها وهەواڵدانیش ســەبارەت بە نەبینراوەکان -غەیب- و نهێنیە وردەکانی ئاســمانەکان وزەووی لەســەر دەســتی یەک پیاو -صـلى الله عليه وسـلم-، ودابەزینی قورئانی بۆی، ولەســەر هەمان پەیامی پێغەمبەرانی پێشــووە، ولەلایەن خوای گەورە ســەرخراوە وکۆچی دوایی نەکرد هەتاوەکو شەریعەتەکەی کامڵ بوو.

بۆیە؛ دانپێدانان بە یەقین ودڵنیاییەوە لەسەر ئەوەی پێغەمبەرە ئەمە ژیری وئاقڵێتیە!

نیشانە غەیبیەکانی پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- زیاترە لە هەزار.

گێڕەرەوەی موعجیزەکانی ؛ هاوەڵانی بوون کە ڕاستگۆترین وچاکەکارترین خوڵقێنراون.

ســەیر ئەوەیە گەورەکانی نێو هاوەڵان مســـوڵمان بوون پێش ئەوەی ئەو موعجیزانە ببینن، وئەوان مسـوڵمـــــان بوون چونکە زانیان پێغەمبەر موحەمەد -صـلى الله عليه وسلم- ڕاستگۆیە، وهەرگیز درۆی نەکردووە.

ئەم هەڵوێستەی گەورەکانی نێو هاوەڵان هەڵوێستێکی ئەقڵی حەکیمانەیە، ڕاستگۆیی پێغەمبەر -صـــلى الله عليه وســـلم- بەڵگەیە وبەســـە بۆ ســـەلماندنی ڕاســـتگۆیی پێغەمبەرایەتی، .. چونکە : ئەو کەسـەی بانگەشـەی پێغەمبەرایەتی دەکات یان ئەوەتا: ڕاستگۆترینی نێو خەڵکیە، چونکە پێغەمبەرە.. وپێغەمبەر ڕاستگۆترینی نێو خەڵکیە.

یان ئەوەتا: درۆزنترینی نێو خەڵکیە، چونکە درۆ دەکات سەبارەت بە گەورەترین بابەت.

---

[٨٧] http://www.nasa.gov/mission_pages/LRO/news/vid-tour.html
https://www.youtube.com/watch?v=UIKmSQqp٨wY

تەنها نەزانەکان جیاوازی ناکەن لەنێوان ڕاستگۆترین ودرۆزنترینی نێو خەڵکی.[88]

زۆر ئاسانە کە ئاقڵ بتوانێت جیاکاری بکات لەنێوان ڕاستگۆترین ودرۆزنترینی خەڵکی.

موشـــریکەکان لە یەکەم ڕۆژی پەیامبەرایەتیەوە دانیان بەوەدا نا کە پێغەمبەر -صـــلى الله عليه وســـلم- هەرگیز درۆی نەکردووە، پێیـان ووت: (هەرگیز نەمـانبینیوە درۆت کردبێت).[89]

کاتێک هەرقل پرســیاری کرد لە ئەبو ســوفیان پێش ئەوەی مســوڵمان بێت: (ئایا ئێوە تۆمەتی درۆکردنتان دەداتەوە پاڵی پێش ئەوەی ئەم قسانە بڵێت؟).

ئەبو سوفیان ووتی: نەخێر.

هەرقل ووتی: (ناکرێت درۆ لەگەڵ خەڵکی نەکات ودرۆ بەناوی خوای گەورە بکات).

پـاشـــان هەرقـل وتە بەنـاوبـانگەکەی ووت: (ئەگەر لەلای بوومـایە ئەوا پێیەکـانیم دەشۆرد).[90]

کافرەکان نەیانتوانی یەک درۆکردنی بســـەلمێنن لە هەموو ژیانیدا -صـــلى الله عليه وسـلم-، بۆیە قورئان نکـــۆڵی کرد لە کوفریان هەرچەندە دەیانزانی حاڵی بەم شـێوەیە پێش ئەوەی ببێت بە پەیامـبەر ، خوای گەورە -سبحانه وتعالى- دەفەرموێت:

﴿أَمْ لَمْ يَعْرِفُوا رَسُــولَهُمْ فَهُمْ لَـهُ مُنكِرُونَ﴾ واتە: ﴿یـان ئـەوەیـە پێغـەمبـەرەکـەیـان نـەنـاســـیووەو ئـەوە بۆتـە هۆی ئـەوەی برِوا بـە پـەیـامـەکـەی نـەکـەن و دژی بوەستن!!﴾[سورەتی المؤمنون: ٦٩].

حاڵ وژیاننامەی پێغەمبەر -صـلى الله عليه وسـلم- بەڵگەیەکی سـەربەخۆیە لەسـەر ئەوەی پێغەمبەرە -صلى الله عليه وسلم-.

---

[88] ثبوت النبوات عقلًا ونقلًا، ابن تيمية، دار ابن الجوزي، ل / ٥٧٣ ، وبمعناه في نفس المصدر ص٣١٨]

[89] صحيح البخاري : ٤٩١٧].

[90] صحيح البخاري : ٧.

ئەگەر هۆکارەکانی ڕاســتگۆیی بەشــێوەیەکی گشــتی پاڵپشــت بن بۆ پێغەمبەرایەتی -صلى الله عليه وسلم-، ئیتر چۆن ئاقڵێک هەموو ئەمانە بەدرۆ دەخاتەوە؟

## ٢١- ئایا ئیمان هێنان بە الله وکوفر کردن بە پێغەمبەران بەســە، هەروەکو هیندۆسیەکان پێی هەڵدەستن؟

و: نەخێر، ئیمان بە بوونی الله لەگەڵ باوەڕ نەبوون بە پێغەمبەران بەس نیە بۆئەوەی مرۆڤ مسولمـــــان بێت، مانای چیە کە باوەڕت وابێت خوای گەورە خوڵقێنەر ورۆزیدەر وبەڕێوەبەری گـــــەردوونە، پاشـــان کوفر بکەیت بە وەحیەکەی ونکۆڵی بکەیت لە پێغەمبەرانی؟

ئەمە کوفری گەورەیە، ئایا کێ تاوانێکی گەورەتری کردووە لەوەی کە نکۆڵی لە وەحی پەروەردگار دەکات، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِاللَّـــهِ وَرُسُلِهِ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُوا بَيْنَ اللَّـــهِ وَرُسُلِهِ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُوا بَيْنَ ذَٰلِكَ سَــبِيلًا * بێگومان ئەوانەی باوەڕ بە خواو پێغەمبەران ناهێنن و دەیانەوێت جیاوازی بکەن لە نێوان خواو پێغەمبەرەکانیدا (گوایە باوەڕیان بەخوا هەیە بەڵام باوەڕیان بەپێغەمبەران نیە)، (یاخود) دەڵێن: باوەڕ دەهێنین بەهەندێک لە پێغەمبەران و باوەڕ بەهەندێکیـــان ناهێنین و دەیانەوێت لەو نێوانەدا ڕێگە و بەرنامەیەک بۆ خۆیان بەدەست بهێنن (١٥٠) أُولَـــئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقًّا وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا * ئا ئەو کەسانە بەڕاستی هــەر بێ باوەڕن و بۆ بێ باوەڕان سزایەکی سەر شۆڕکەرمان ئامادەکردوە (١٥١) ﴾[سورة النساء].

هەرکەسێک باوەڕی بە الله هەبێت وکافر بێت بە بەپێغەمبەران ئەوا لەڕاستیدا کافرە.

هەرکەســێک کوفر بکات بە پێغەمبەرێک لە پێغەمبەرەکان ئەوا کافرە بە الله چونکە نکۆڵی کردووە لە وەحی، بۆیە ئەهلی کیتاب کوفریان کرد بەهۆی باوەڕ نەبوونیان بە پێغەمبەرایەتی موحەمەد -صلى الله عليه وسلم-،

﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا أُولَـــئِكَ هُمْ شَرُّ الْبَرِيَّةِ﴾ واتە: ﴿بەڕاســتی ئەوانەی بێ باوەڕ بوون لە خاوەن کتێبەکان و موشـریك و

هاوەڵگەران دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوەو بە نەمری تیایدا بۆ هەمیشـــە دەمێننەوە، هەر ئەوانەن تاوانبارترین و خراپترینی خەڵکانی سەرزەوی﴾[سورة البينة: ٦]

وپەیمانی خوای گەورە بەوەی دەچـــــنە دۆزەخەوە هەق وڕاسـتیە ؛ ﴿فَحَقَّ وَعِيدِ﴾ واتە: ﴿بەهۆی ئەوەوەشایستەی پێشهاتنی هەڕەشەی ئێمە بوون﴾[سورة ق: ١٤].

ئیسلامەتی مرۆڤ دامەزراو نابێت ورزگاری نابێت تەنها بەهۆی دانپێدانانی مرۆڤ لەسەر ئەوەی خوای گەورە خوڵقێنەر -الخالق- وڕۆزیدەرە -الـــــرزاق- وژیینەرە -المحيي- ومرێنەرە -المميت-ە، بەڵکو دەبێت مرۆڤ باوەڕی بە پێغەمبەران هەبێت.

بۆیە ئیمان هێنان بە بوونی الله وکوفر کردن بە پێغەمبەران تـــەنها بەس نیە وسوودی بۆ بەندە نیە لە قیامەتدا، چونکە دەبێت بەندە خوای گەورە بپەرســتێت وباوەڕی بەهەموو پێغەمبەران هەبێت.

ئەگەر ئیمـان هێنـان بە الله بەس بوایە ئەوا خوای گەورە پێغـــــەمبەرانی نەدەنارد وکتێبەکانی دانەئەزاند، چونکە هەموو مرۆڤایەتی خوای گەورە دەناسن لە فیترەتەوە.

خوای گەورە کە تۆی خوڵقاندووە وهیدایەت وڕۆزی داویت تەنها ئەو شـــایســـتەی پەرستنە بەپێی شەریعەتەکەی کە پێغەمبەران هێناویانە.

بۆیە دەبێت مرۆڤ ئیمان بهێنێت بە هەموو پێغەمبەران وبە کۆتا پێـغەمبەر موحەمەد کوڕی عبدالله -صلى الله عليه وسلم-.

## ٢٢- بۆچی خوای گەورە شــەڕ وخراپەی دروســـتکردووە؟ یـان بەمانایەکی تر :چۆن مسـوڵمان وەڵامی (دژبێژی: -پارادۆکس-)ی شەڕ وخراپە بداتەوە؟

و: فیتنەی شــەڕ تاڕادەیەکی زۆر گەورەترین کێشــەیە لە هیندۆســیەت وفەلســەفەی هیندۆسیەت دامەزراوە لەسەر ئەوەی مرۆڤ لە شوێنە پیس وچۆڵەکان دەژی بۆئەوەی لە شــەڕ ڕزگاری بێت، وهیندۆســیەت وایدادەنێت کە دووبارەبوونەوەی لەدایکبوونەکان بەهۆی ئەو شەڕ وخراپەیە کە مرۆڤ دەیکات لە ژیانی پێشووتری.

وئەمە هەمووی هەڵەیە شـــەڕ وخراپە بوونی هەیە لە جیهـانـدا چونکە ئێمە تەکلیف لێکراوین -ئەرکی شەرعیمان لەسەرە-.

ئێمە لەم ژیانەدا لە تاقیکردنەوەداین.

خوای گەورە -سبحانە وتعالی- دەفەرموێت:

﴿وَنَبْلُوكُم بِالشَّـــرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً﴾ واتە: ﴿بێگومان ئێمە ئێوە تاقی دەکەینەوە بەشـــەڕ و ناخۆشی و بەڵاو بەخێرو خۆشی و دارایی و توانایی﴾[سورة الأنبياء: ٣٥].

خێر وشەڕ هەیە چونکە تۆ موکەلەفیت، وتەکلیف مەبەستە لە بوونت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْـــسَنُ عَمَلًا وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ﴾ واتە: ﴿هـەر ئـەو خـۆی مردن و ژیـانی بـەدیهێناوە، تـا تـاقیتـان بکـاتـەوە، کێتان کردەوەی چاکترو پەسەندترە، هەر ئەویش زاتێکی باڵادەستە بەسەر بێ باوەڕاندا، وە لێخۆشبووە لە ئیمانداران﴾[سورة الملك: ٢]

لەبەرئەوەی ئێمە -موکەلەف-ین بۆیە سروشتیە تووشی فیتنە وتاقیکردنەوە وبەڵا بین ؛ وسروشتیە کە شەڕ تێماندا هەبێت.

شەڕ وخراپە وهەندێک ئازار وتوانای کردنی تاوان ئەمە داواکراوی سروشتی وسەرەنجامی سەرەتاییە بۆ ئازادی خواست -ئیرادە- وتەکلیفی خودایی.

بوونی شـەڕ وخراپە وبەڵا وکارەسـات وشـەهوەت ئەمانە باشـترین دەردەهێنن لە ناخی مرۆڤی چاک وخراپترین دەردەهێنن لەناخی مرۆڤی خراپ.

و لەگەڵ شەڕدا ؛ ئێمە لە خێرێکی زۆردا دەژین کە لە ژماردن نایەت.

هەروەها نیعمەتی زۆریش کە لە ژماردن نایەت.

شەڕ کەمە بە بەراورد لەگەڵ ئەو خێرە زۆرەی ئێمە تێیدا دەژین.

ئەگەر شەڕ نەبوایە لە جیهاندا ئەوا تۆ دەرنەئەچوویت لەو شوێنەی تێیدا لەدایکبوویت!

وشـارسـتانیەت بوونی نەدەبوو وشـار وکارگە وماڵەکان دروسـت نەدەکران وخەڵکی پێویسـتیان بەوە نەبوو کە کار بکەن وخەڵکی بیریان نەدەکردەوە لە ڕووبەڕبونەوەی نەخۆشـی یان چارەسـەرکردنی کێشـەکان یان داهێنانی بیرۆکەیەک ببێتە هۆی هێنانی ئاسانکاری بۆ مرۆڤەکان!

کەس پێویستی بەوە نەبوو لە شوێنی لەدایکبوونیەوە بڕوات بۆ شوێنێکی تر.

چونکە نە شەڕ ونە کێشە ونە ناڕەحەتی ونە فیتنە ونە خەفەت هەیە بۆئەوەی بەدوای چارەسەرکردنیان بگەڕێت!

بۆچی خۆی تووشی ماندووێتی وشەونخونی وبیرکردنەوە وکارکردن بکات؟

شەڕ پێویستیەکە کە بوونی هەیە لەم دونیایەدا !

بۆیە بیر بکەرەوە !

زۆرێـک لە خەڵکی کاتێک تووشـی ناڕەحەتی وفیتنە وشـەڕ دەبن ؛ دەگەڕێنەوە بۆ لای خوای گەورە، ودەبن بە یەکێک لە پیاوچاکان -سبحان الله العظیم وبحمده-.

هەموو قەدەرەکانی خوای گەورە حیمکەت وخێری تێدایە ئەگەرچیش هەندێکی شـەڕ وتەنگانە وئازاری پێوە دیار بێت لەئاشکرادا، بەڵام لە کۆتاییدا خێرێکی زۆر وحیکمەتێکی مەزنی خودایيان تێدایە.

شەڕ ورخراپە هەیە چونکە ئێمە موکەلەفین -ئەرکی شەرعیمان لەسەرە- نەک بەهۆی ئەوەی تۆ تاوانێکت کردووە لە ژیانێکی پێشووتردا.

## ٢٣- ئایــــا ئاماژەکانی تەسـلیم وملکەچبوون بۆ الله -سـبحانه وتعالی- چیە؟ یان بەشـــێوازێکی تر :چۆن دەزانیت تۆ تەســلیم وملکەچیت بۆ الله بەشێوەیەکی تەواو وکامڵ؟

و: نیشانەکانی ملکەچی وتەسلیم بوون بۆ خوای گەورە چوارن، ئەوانیش بریتین لە:

یەکەم: بەندایەتی بۆ خوای گەورە لە هەموو بچووک وگەورەیەک لە ژیانتدا، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿قُلْ إِنَّ صَـــلَاتِي وَنُسُـــكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ * (ئەی پێغەمبەر ﷺ) بڵێ بێگومان نوێژ و (بەندایەتی) و قوربانی و ژیان و مردنم هەر بۆ خوای پەروەردگاری هەموو جیهانیانە (١٦٢) لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ * ئەو زاتە هیچ هـاوەڵ و هـاوبەش و شـــەریکێکی نیە و من بـەوە فـەرمـانم پێـدراوە و من یـەکـەم کـەســی موسوڵمانانم (١٦٣)﴾[سورة الأنعام].

﴿صَـــلَاتِي وَنُسُـــكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ * بێگومان نوێژ و (بەندایەتی) و قوربانی و ژیان و مردنم هەر بۆ خوای پەروەردگاری هەموو جیهانیانە﴾ : هەموو شــتێک دەیکەم بۆ خوای گەورەیە، هەمووی بەنـدایەتیە بۆ خوای گەورە لە هەموو کـارێـک، وئەمە یەکەم نیشانەی ملکەچی وتەسلیم بوونە بۆ الله.

نیشـــانەی دووەم: بۆئەوەی تەســـلیم وملکەچی خوای گەورە بیت بەتەواوی وکامڵی ؛ دەبێت شـوێنی فەرمانەکانی خوای گەورە بکەویت وپەیڕەویان بکەیت ودوور بکەویتەوە لەو شـــتـانەی خوای گەورە نەهی لێیـان کردووە، خوای گەورە -ســبحـانـه وتعـالی- دەفەرموێت:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّــــهَ وَرَسُـولَهُ وَلَا تَوَلَّوْا عَنْهُ وَأَنتُمْ تَسْـمَعُونَ﴾ واتە: ﴿ئەی ئـەوانـەی بـاوەڕتـان هێنـاوە، فـەرمـانبـەرداری خـواو پێغـەمبـەرەکـەی بن و لـە بـەرنـامـەی ئەوزاتە پشت هەڵمەکەن، لەکاتێکدا ئێوە تێدەگەن و دەبیسن﴾[سورەتی الأنفال: ٢٠].

وخوای گەورە -عز وجل- دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ادْخُلُوا فِي السِّلْمِ كَافَّةً﴾ واتە: ﴿ئەی ئەوانەی ئیمان و باوارِتان هێناوە هەر هەمووتان خۆتان بخەنە ژێر ســـایەی ئیسلامەوە و بە تەواوی پەیڕەوی بکەن﴾[سورەتی البقرة: ٢٠٨].

﴿فِي السِّلْمِ﴾ واته: بێنه نێو ئاینی ئیسلامەوە.

﴿ادْخُلُوا فِي السِّــلْمِ كَافَّةً﴾ واته: پابەندی هەموو فەرمانێک بن کە خوای گەورە فەرمانی پێکردووە ودوور بکەونەوە لە هەموو شتێک کە ئەو زاتە مەزنە نەهی لێکردووە.

ئەگەر خوای گەورە فەرمانی بە هەرشتێک کردبێت لە قورئاندا یان پێغەمبەر -صلی الله علیه وسلم- فەرمانی بە هەرشـتێک کردبێت لە سـونەتدا ؛ جێبەجێی دەکەم، وئەگەر خوای گەورە نەهی لە هەرشـــتێک کردبێت لە قورئاندا یان پێغەمبەر -صــلی الله علیه وسـلم- نەهی لە هەرشـتێک کردبێت لە سـونەتدا ؛ لێی دووردەکەومەوە، ئەمە کامڵی وتەواوی ملکەچی وتەسلیم بوونە بۆ خوای گەورە.

نیشـــانەی ســـێیەم: کە ئاماژەیە بۆ ملکەچبوون بۆ الله بریتیە لە حوکم وفەرمانڕەوایی کردن بە شەریعەتەکەی، ڕازین بە شەریعەتەکەی وقبوڵی دەکەین.

هەموو شـتێک لە شـەریعەتی خودا لە قورئان ولە سونەتی پێغەمبەر موحەمەد -صلی الله علیه وســـلم- قبوڵ دەکەین، چونکە خوای گەورە دەزانێـت چی بـاشـــە بۆ خوڵقێنراوەکانی.

﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾ واته: ﴿مـەگـەر خوا نـازانێـت کێی دروســـت کردووەو چۆنی دروســـتی کردووە، لەکاتێکدا ئەو زاتە وردکارو بە ســـۆزو ئاگایە.﴾[ســـورة الملك: ١٤]

وهەروەها -سبحانە وتعالی- دەفەرموێت:

﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَـــنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ واته: ﴿ئایا ئەوانە حوکم و فەرمانڕەوایی جاهیلیەت و نەفامیان دەوێت و ئەویان لاپەســـەندە؟! (ئاخر بۆ بیرناکەنەوە) کێ هەیە بەقەدەر خوا حوکمی جوان و چاك و بەجێ بێت، (بەتایبەت) لای ئەو کەســـانەی کە بەوردیی ســـەرنج دەدەن و ویژدان و هەســـتی زیندوویان هەیە﴾[سورەتی المائدة: ٥٠]

تەنها خوای گەورە دەزانێت چی باشترینە بۆ خەڵکی بۆ دونیا وقیامەتیان.

پەیڕەو وجێبەجێکردنی شـــەریعەتی الله دەبێتە هۆی پاکبوونەوەی خەڵکی ولە هێمنی وئاسایش دەژین.

خوای گەورە -عز وجل- دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذْنِ اللَّـهِ﴾ واتە: ﴿هیچ پەیامبەرێکمان نەناردوە مەگەر تەنها بۆ ئەوەی گوێڕایەڵی بکرێت بەفەرمانی خوا﴾[سورەتی النساء: ٦٤]

خوای گەورە پێغەمبەرانی نەناردووە بۆئەوەی واز لە شـــەریعەتی ئەوان بهێنین وحوکم بکەین بە شەریعەتی خەڵکانێکی تر.

خوای گەورە -سبحانه وتعالى- دەفەرموێت:

﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَـــجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَـيْتَ وَيُسَـــلِّمُوا تَسْـلِيمًا﴾ واتە: ﴿نەخێر (وانیە کە خۆیان بە باوەڕدار نیشـــیان دەدەن) سـوێند بەپەروەردگارت بڕوادار نین هەتاوەکو تۆ نەکەنە دادوەر لە هەر ئاژاوە و دووبەرەکیەکی نێوانیان دا لە پاشـــان هەســـت نەکەن لە دەرونیاندا بەهیچ بێزارییەک لەو بڕیارەی تۆ داوتە و ملکەچ نەبن بەملکەچیەکی تەواو﴾ [سورة النساء: ٦٥].

دەبێت مسـولْمان بەتەواوی ملکەچی شـەریعەتی الله بێت، ملکەچبوون بۆ شـەریعەتی الله لە نیشانەکانی پەیڕەوکردنی ئاینی ئیسلامە !

نیشـــانەی چوارەم: کە ئاماژەیە بۆ تەســـلیم بوون بۆ الله، وملکەچبوون بۆ قەدەرەکانی خوای گەورە، هەموو شـــتێک پەروەردگار لە قەدەردا نووســـیویەتی بۆیە مســـوڵمان ملکەچی فەرمانەکانی خوای گەورە دەبێت لە هەموو قەدەرەکانیدا، لە خێر وشەڕدا.

ئەگەر مسـوڵمان خێرێک بێـــتە ڕێگای ؛ شـوکر وسـوپاسـی الله دەکات، وئەگەر تووشی زیانێک بێت ؛ ئارام دەگرێت.

هەموو تاقیکردنەوەیەک بۆ حیکمەت و پێسپاردنی ئەرکێکە -بۆ تەکلیفێکە-.

هەموو شـــتێک بە قەدەری خوای گەورەیە -عز وجل- : لەش ســـاغی ونەخۆشـــی ودەوڵەمەنـدی وهەژار وهتـد هەموو شـــتێـک بە قەدەر وحیکمەتی خوای گەورەیە، ومسوڵمان دەبێت ڕازی بێت بە قەدەری خوای گەورە چونکە ئەو لەسەری نوسیوویەتی.

خوای گەورە -سبحانه وتعالى- دەفەرموێت:

﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾ واتە: ﴿بێگومان ئێمە هەموو شتێکمان بەئەندازەو نەخشەی دیاریکراو دروست کردووە﴾[سورة القمر: ٤٩].

وخوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُل لَّن يُصِيبَنَا إِلَّا مَا كَتَبَ اللَّـهُ لَنَا﴾ واتە: ﴿(ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تۆش بڵێ: هەرگیز لەوە زیاترمان بۆ پێش نایەت جگەلەوەی کە خوا بۆی نوسـیووین (هەرچیش بۆمان پێش دێت هەر خێرە بۆمان)﴾[سـورەتی التوبة: ٥١].

تەنها ئەوە دێتە ڕێمان کە خوای گەورە لە قەدەردا بۆ ئێمەی داناوە.

وپەروەردگار دەفەرموێـت:

﴿وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّـهِ﴾ واتە: ﴿هیچ کەسـێکیش نامرێت مەگەر بەویستی خوا نەبێت﴾[سورەتی آل عمران: ١٤٥].

ئەجەلەکان خوای گەورە لەقەدەردا نووسیویەتی.

هەموو شـتێک لەگەردووندا ڕوودەدات وهەموو گەردیلەیەک دێت ودەڕوات لە جیهاندا وهەموو ڕووداوێک، بە زانست و ویست وقەدەر وحیکمەتی خوای گەورە ڕوودەدات.

خوای گەورە -سبحـانە وتعالى- دەفەرموێت:

﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا﴾ واتە: ﴿هەموو شتێکی دروستکردووە بە ئەندازە و قەبارە و شـێوە و تام و بۆن و ڕەنگ و جیاوازی هەمە جۆر... هتد، نەخشـەی ڕێک و پێکی بۆ هەموو شـتێک داناوە (بە شـێوەیەک کە پێویسـتیەکانی ئادەمیزاد دابین بکەن و لە خزمەتیدا بن)﴾[سورة الفرقان: ٢]،

خوای گەورە -سـبحانە وتعالى- هەموو شـتێکی خوڵقاندووە ولە قەدەردا نووسـیویەتی، وئەوەی خوای گەورە ویستی لەسەر بێت ؛ ڕوودەدات، وئەوەی ویستی لەسەر نەبێت ؛ ڕوونادات.

من وەکو مسـوڵمانێک داواکراوە لێم کە تەسـلیم وملکەچی هەموو قەدەرەکانی خوای گەورە بم -عز وجل-.

بۆیە بەم شێوەیە مرۆڤ مسوڵمان دەبێت وملکەچ دەبێـت بۆ الله.

## وله کۆتاییدا ! چۆن ببم به مسوڵمان وبێمه نێو ئاینی ئیسلامەوە؟

ئیسلام ئاینی الله یه بـۆ هەموو مرۆڤایەتی، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ ...﴾ واته: ﴿ئاینی ڕاست لای خوای گەورە ئیسلامه...﴾[سورەتی آل عمران: ١٩].

ئیســـلام ئەو ئاینەیه که خوای گەورە هیچ ئاینێک قبوڵ ناکات جگه لەم ئایینه نەبێت، ﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْــلَامِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِــرِينَ﴾ واته: ﴿و هەرکەســێک ئاینێکی تر پەیڕەو بکات جگه له ئیســـلام هەرگیز لێی قبوڵ ناکرێت له قیامەتیشدا له دۆڕاوەکان دەبێت﴾[سورەتی آل عمران: ٨٥].

بۆیه واجبه لەســەر هەموو هیندۆســی وناهیندۆســیەک ؛ مســوڵمان بێت وپەیڕەوی ئیسلام بکات.

چونکه ئیسلام هۆکاری ڕزگاربوونه له دۆزەخ وهۆکارە بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە وبەهەشت.

وهاتنه نێو ئیســـلام نیعمەتێکه له گەورەترین نیعمەتەکان، بەڵکو گەورەترین نیعمەته وگرنگترین شته له بووننتدا.

وئیسلامەتی لەڕاستیدا گەڕانەوەیه بۆ فیترەت وئەقڵ وڤیدا.

هاتنه نێو ئیســلام زۆر ئاسـانه وپێویســتی به ڕێورەســم وشـتی فەرمی نیه، بەڵکو تەنها لەسەر مرۆڤه که شایەتمان بڵێت: (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدًا رسول الله) واته: (شــاهێدی دەدەم بەوەی هیچ پەرســتراوێک شــایســتەی پەرســتن نیه به هەق وڕاســتی جگه له الله -تەنها الله پەرســتراوی هەقه-، وشــاهـــــێدی دەدەم موحەمەد پێغەمبەر ونێردراوی خودایه).

بەم شێوەیه دەبێته مسوڵمان.

پاشان ئەوەی داواکراوە له ئاینی ئیسلامدا پەیڕەوی دەکات.

ڕێنموێنی دەکەم به ســەیرکردنی ماڵپەڕی ئیســلام هاوس (دار الإســلام)، وهەریەکێک بەپێی زمانەکەی، بۆئەوەی مسوڵمانی نوێ بزانێت چۆن ئاینی ئیسلام پەیڕەو دەکات.

بەستەری ماڵپەرەکە: https://islamhouse.com/ar

# پێڕست

(کلیك لەسەر سەرەبابەتەکە بکە بۆئەوەی بچیتە سەر بابەتە لە لاپەڕەکەی خۆیدا)

